کتێبی

ژماره ٦

# سەلەفیەت

[illegible]

نەك

مەزەبێکی

ئیسلامی

نووسینی

دکتور محمد سعید رمضان البوطي

لیژنەی وەرگێڕان: لە پەیڕەوانی سوننەت و جەماعەت

پێداچوونەوەو پێشکەشکردنی

شێخ محسن ی شێخ خالدی مفتی

# سەلەفیەت

## قۆناغێکی وەختی یە نەک مەزەبێکی ئیسلامی


نووسینی

دکتۆر محمد سعید رمضان البوطي

لیژنەی وەرگێڕان لەپەیڕەوانی سوننەت و جەماعەت

پێداچوونەوەو پێکەشکردنی

شێخ محسن ی شێخ خالدی مفتی



لەبڵاوکراوەکانی

نووسینگەی بوخارا لەهەولێر

١٤٢٠ ک / ١٩٩٩ ز




- ناوی کتێب : سه‌له‌فیه‌ت قۆناغێکی وه‌ختی یه نه‌ک مه‌زه‌بێکی ئیسلامی .
- نووسه‌ر : دکتۆر محمد سعید رمـضـان البوطـی .
- وه‌رگێران : لیژنه‌ی وه‌رگێڕان له‌په‌یره‌وانی سوننه‌ت و جه‌ماعه‌ت .
- پێداچوونه‌وه‌و نووسینی بۆچوون له‌سه‌ری : شێخ محسن شێخ خالد مفتی .
- ساڵی چاپ : ١٤٢٠ ك / ١٩٩٩ ز .
- چاپی : یه‌که‌م
- مافی چاپ : پارێزراوه
- له‌بڵاو کراوه‌کانی نووسینگه‌ی بوخارا له‌هه‌ولێر .

ژماره‌ی سپاردن به کتێبخانه‌ی به‌ڕێوه‌به‌رایه‌تی رۆشنبیری و هونه‌ر (٣١١) ساڵی ١٩٩٩پێدراوه

- پیت چنین و نه‌خشه‌سازی نووسینگه‌ی بوخارا بۆ کۆمپیوته‌ر

چاپخانه‌ی زانکۆی سه‌لاحه‌ددین — هه‌ولێر

# کتێبی سەلەفیەت و هەڵوێستەیەک لە سەر کاردانەوەی ئیسلامی سیاسی لەکوردستاندا

بەقەڵەمی

شێخ محسن شێخ خالد مفتی

بسم الله الرحمن الرحيم

الحمد لله رب العالمين والصلاة والسلام على أشرف المرسلين سيدنا محمد وآله وصحبه أجمعين .

موسوڵمانانی خۆشەویست : .

ئەم کتێبەی لەبەردەستی بەرێزتایە ، وەپەرەکانی هەڵئەدەیتەوە ، بەدەست و قەڵەمی زانایەکی بەرزو گەورەو شارەزا نوسراوەتەوە ، ئێمەیش بە پێویستی ئەزانین هەندێ لەبارەی ناوەڕۆکی کتێبەکەو ، هەندێ سەرنجی ترمان تۆمار بکەین دەربارەی ئیسلامەتی بە گشتی و ، ئیسلامی سیاسی بە تایبەتی ، بۆیە سەرنجی ئەم خاڵانەی خوارەوە ئەدەین بۆ ئەوەی تیشکێ بخەینە سەر ئەو بابەتەی کەپێویستە ئاخاوتنی لەسەر بکەین :

١ ... هەر پەراوێ کەسەیری دانەرەکەی بکەیت ، بەپێی کەسایەتی زانستی و کۆمەڵایەتی ئەو نوسەرە ، بە چاک و خراپ هەڵدە سەنگێترێت ، بۆیە خەڵکی کوردوستانی ئێمە ، لەروانگەوی ئەو هەموویەندوو ئامۆژگاری یەی ، کە لە کتێبی (فقه السيره) وە پەراوە بە نرخەکانی تری دکتۆر (محمد سعيد رمضان بوطی)یەوە ، سەیری نوسراوەکانی ئەکەن ، کە لەجیهانی ئیسلامی ئەمڕۆدا جێگای شانازی یە کوردێکی موسوڵمان و مەلایەکی شەرع زان و ، دکتۆرێکی شارەزاو رۆشنبیر .. دەیان ساڵە خزمەت بە ئیسلام دەکات ، بەرێبازو بەرنامەیەکی زانستییانەوە .

بۆیە کاتێک لە بارەی بابەتێکی مێژوویی و ئیسلامیەوە بنوسێت زیاتر نرخ و بەهای پێ دەدات و ، سەرنجی خوێنەران بۆلای رادەکێشێت .

٢ .... ئەو بابەتەی کەهەڵی بژاردووەو و باسی لێوە دەکات بەڕاستی بابەتێکی هاوچەرخ و گرنگ و پێویستە و ، گیرو گرفت و کێشەیەکی زۆریناوەتەوە و ، سەرێشەی بۆ زۆر لە موسوڵمانە خەمخۆرەکانی ئیسلامی دروست کردووە ، لە سەرانسەری وڵاتانی ئیسلامی ئاوەدانی ئەمڕۆدا بۆتە نیشانەی پرسیارو ، خەڵکێکی موسوڵمان و

رۆشنبیر دەیانەوێت لەو باسە بگەن ، کەسەلەفییەت چییە و ، لەسەر چ بنەماو ، لە چ کات و بوارێکدا سەری هەڵدا ، ئایا سەلەفییەت واتە (پێشینەویستی)بەچی دەوترێت ؟ پەیوەندی بەمەزهەب و بەرنامەو مەبدەئەوە هەیە .. یان تەنها قۆناغێکەو ئیسلامی پیا تێپەڕیوە ، ئایا هەرگیز پێغەمبەری خودا (ﷺ) فەرمانی داوە ، کە پێویستە شوێن ئەورێبازو ناوە داهێنراوە بکەوین ؟ ! ئایا لە ئیجتیهادی ئیمامە بەرزەکانی ئیسلامدائەم باسە هاتۆتە کایەوە ؟! ئایا سەلەفییەت دانراوە بە یەکێک لە بنەماکانی هەڵێنجانی ئەحکامی شەرعی و سەرچاوەی فتوادانی موجتەهیدو زانا شەرع زانەکان ..؟! وە سەرچاوە بنەڕەتیەکانی دوای کیتاب و سوننەت کە( ئیجماع و قیاس ) بگرێتەوە یان مەصالیحی مورسەلەو قەولی صحابی و کرداری ئەهلی مەدینەو ...هتد ) کەهەندێ لەئیمامەکان ، وەک سەرچاوەی تەشریع هەندێکیان ، یان هەموویان داناوەکەواتە رونکردنەوەی ئەم باسە ، پێویستیەکی هەنوکەیی یەو گرێ کوێرەی دڵی زۆر کەس دەکاتەوە و ، خزمەتێکی باشیش بەئیسلام دەکات .

٣.... شێوازو جۆری گفتو گۆو موناقەشەکردن ، لەسەر ئەو بابەتە گرنگەیە ، بێ ئەوەی شێوەی توندی و قسەی رەق و هەڵچون و بەرزو نزمی تیابەکاربهێنرێت ، یان بەزاراوەی ئەمرۆ دور بێت لە شێوەکانی توندڕەوی، لە بڕیارو بۆچون و هەڵوێست وەرگرتن دا ، کە ئەمە بۆخۆی نیشانەیە لەسەر رەوایی قسەکان و ، بەهێزی و بتەوی بەڵگەکان ، کە بۆ خۆیان ئەچنە ناو دڵەوە و ، متمانە بە خوێنەر پەیدا دەکەن ، ئیتر پێویستیان بەوە نی یە کەبەزەبری توندی و سوێند خواردن و قسەی رەق ساغ بکرێتەوە بەسەریاندا .

بەراستی سەر لەبەری ئەم پەرتوکە بخوێنەرەوە ، هەست بەوە ناکەیت هەڵچونێکی تیا بێت یان شێوازی قسەو ئاخاوتنی گۆڕی بێت ، چونکە بەداخەوە زۆر پەڕاوی ئەمرۆ کە دەخوێنیتەوە ، هەر لەسەرەتاوە پڕیەتی لە قسەی رەق و ناشیرین ، ئیتر شەوقت ناهێڵێ بۆ خوێندنەوەی پاشماوەکەی ، بەڵام نوسەری سەرکەوتوو ، هەمیشە بەزوبانێکی ئەدەبی و هێمنیەوە لەگەڵتائەدوێ ، دڵت ئازار نادات و ، هەستت بریندار ناکات ، لە پێشەوە هەموبۆچون وراکان دەخاتە بەرچاو ، تا خوێنەر واهەست بکات کەمەسەلە دژایەتی و قسە بەزۆرانداندن نی یە ، بە ڵکو حیوارێکی هێمن و لە سەرخۆیەو ، هەوڵدانێکە بۆ گەیشتنە ئەنجام ، کە لەپێش دۆست و هاورازەکەی ، خوێنەری بێگانەو بەرامبەرەکەی لە قسەکانی دڵنیاببێت و ، دروشمی سپی هەڵبدات و ، خۆی بدات بەدەستەوە ، کاتێک کە جۆری گفتو گۆی ناو کتێبەکانی دکتۆر (البوطی) شارەزائەبیت ، بۆت دەردەکەوێت کە هێشتا کەمان ووتووەو ، پێویستی بەوە هەیە باشتر قسەی لەسەر بکەین .

٤ .....ئامانج لەدانانی ئەم پەڕاوەیە ، گەیشتنە بە خزمەت کردنی ئیسلام وموسوڵمانان ، وە هەوڵدانە بۆ یەک ڕیزی و برایەتی و هاوڕازی ، نەک لێک ترازان و دوبەرەکی و دژایەتی ، بۆیە هەرگیز بەدوای ئەوەدا ناگەڕێ ، بەزەبری قسەکردن ڕاکەی خۆی سەربخات و بەرگری لێ بکات ، بە ڵکو بەرنامەو شێوازێکی لە نوسینەکەدا دامەزراندووە ، سەرەتا هەموو جۆرە ڕادۆ بە یەکەکان باس دەکات و ، لەپاشان شوبهەو نیشکالەکان شیتەڵ دەکاتەوە ، بە ڵگە بۆ ڕا پەسەند وشیاوەکان دێنێتەوە ، پابەندی لە وئامانجە دەکات کەدەیەوێ بە هەموتوانای خزمەتی بکات ، ئەویش بەرگری کردنە لە ئیسلام ، بەهۆی بەرنامەیەکی زانستیانەوە ، دوورلەهەڵچون و تەنگەنەفەسی ، جاری واهەیە ڕای دژ بەخواست و ڕاستی دەهێنێتە کایەوە ، ئەوەندە بە جوانی باسی دەکات خوێنەری نەشارەزا پشوی تەنگ دەبێت ، وادەزانێ بەرگری لێ دەکات ، بەرامبەرەکەیشی دڵ بەخۆی خۆش دەکات ، کە نووسەر چەندبە ئینسافەوە باسی ڕاو بۆچونەکان دەکات ، هەست دەکات کەمەبەست لەو نوسینە دژایەتی کردنی ڕاو فیکرەیەک نی یە ، بە ڵکو دەرخستنی حەقیقەتە ، بۆیە بەچاوی ڕێزەوە دەڕوانێتە ڕای خەسمەکەی ، وەهیچ کات بەتوندی ڕەددی ناکاتەوە ، تابەڵگەکان بەپێی بەرنامەزانستی یە کە دەردەخات ، لەپاشان بەرپەرچی هەموو شوبهەو ڕا جیاوازشازەکان دەداتەوە ، وە خوێنەر لە کەشتی متمانە و دڵنیاییدا دەیگەیەنێتەبەری هێمنی و متمانەو ئەمینی .

٥ ..... دکتۆرمحمد بە هۆی گەڕان و بەشداری لە نەدوەو سیمینارو کۆڕو کۆنگرە ئیسلامیەکان و ، سەردانی وولاتانی جیهانەوە ، زیاترشارەزای دەردی کوشندەی ناوکۆمەڵگای ئیسلامی بووەو ، دەزانێت کە زۆربەی زۆری ڕۆشنبیرانی ئیسلامی دەناڵێنن بە دەست ئەولایەنە فیکریەوە کەبە بێ بنەمای بەڵگەوزانستی سواری قسەی خۆیان دەبن و ، ڕاست وچەپ بە کافر دەزانن و ، خۆیشیان دەکەنە مەلەوانوسوار چاکی مەیدان و ، ئەوەی شوێنیان کەوت ، ئەوا ژین و دینی پارێزراوەو کلیلی ڕزگاربوونی پێ دەبەخشن ، ئەوەش متمانەی پێ نەکردن ، وە لێ یان ئەمین نەبوو ئەوا لە نیوەڕۆی ڕۆشندا و ، بەبەرچاوی دۆست و دوژمنەوە ڕای دەگەیەنن کە : ئەوە کافرەو لەئیسلام بەدەرە ، ژیانی لێدەکەن بەشەوە زەنگی تاریکستان ، کەواتە چارەسەرکردنی ئەم کێشەو گرفتە کارێکی پێویست و زەروری یە ، وە کەسایەتییەکی بەتواناو شارەزای وەک مامۆستای دانەرەدەوێ ، کەڕاستی یەکان ڕون بکاتەوەو ، بەرگری لەڕێبازی ئیسلام بکات ، وە حەقیقەتی مەزهەبەکان دیاری بکات و ، ڕوی ڕاستیش لە سەر ئەو بابەتە هەڵبماڵێ ، کە سەلەفییەتیان کردوە بە مەزهەب و ، کۆمەڵە مەرجێکیان بۆ دیاری کردوون ، کەنە خۆیان پابەندی لێ دەکەن و نە لەپێشوانیشدا هاتۆتە دی ، هەندێ بۆچونی

خۆیان کردۆتە بنەما ، بۆبەرنامەو ڕێبازە داهێنراوەکەیان ، کە کەسانێکی تر لە پێشەوە ئەو ڕایەیان نەبووە ، یان پابەندیان لێ نەکردوە ، بۆ نمونە : خۆیان بەسەربەست و ئازاد دەناسێنن ، وە پابەند نین بە هیچ مەزهەبێکەوە ، دەڵێن ئێمە سەلەفین ، وە تەنها لە کیتاب و سوونەتەوە فەرمان وەدەگرین ، وەڕێنماییەکان دیاری دەکەوین ، ئەگەر پێ نەگیرێن ، ئەوا بەدمەزهەبی هەڵدەبژێرن ، چونکە لایان وایە کە مەزهەبی چوار ئیمامەکە زیادەو ، پێویست ناکات ئەو تەوقە بخەنە ملی خۆیانەوە ، بەڵام ئەگەر پێ گیران و ، بەبەڵگە ئەم لاو لایان لێ تەنرا ، ئەواناچار پەنادەبەنە بەر ئەوەی ، کەخۆیان بەحەنبەلی مەزهەب دەناسێنن ، بەڵام لەزۆر بەی مەسئەلە شەرعیەکاندا ، هیچ پابەندی یەک لە بنەماو فتواکانی مەزهەبی ئیمام ئەحمەدی کوڕی حەنبەلیش ناکەن .

٦ .... ئەوەی ئەمڕۆ سەلەفیەکانی پێ ناسرابێ ، پابەندی نی یە بەڕێبازی ( سەلەفی صالحین ) ، بەڵکو خۆ جیاکردنەوەیە لە ڕای کۆمەڵی موسوڵمانانی (ئەهلی سوننەت و جەماعەت ) کە ئەمەش دیاردەیەکی زۆر نەشازو نا هەموارە ، وە مایەی بەدبەختی و بێ چارەیی گرۆی ئیسلامی یە ، جگە لەوەی موسوڵمانان بەدەست دوژمنانی دینەوە ، لەدەیان لاوە ئەناڵێنن و ، دوچاری هێرشی بەربلاوی فیکری وبەناو ڕۆشنبیری و عەولەمەی ئەم سەردەمە بوونەتەوە ، کەبەرنامەی زانستی تیارەچاو نەکراوە و ، پێشکەوتنی هەموو لایەنە کانی تەکنۆلۆژیا و سیستەمی نوێی جیهانی ئەمڕۆ ، لە بریتی خزمەت کردن ، کارێکی تریان پێ سپێرراوە ،کە لە پاڵ سەرسام بوونی خەڵکی لەو جۆری پێشکەوتن و ، ئەو هەموودەسکەوتە ماددیانەی کە شانازی پێوەدەکەن و، لایەنێکی گەورەی ژیانیان پڕ کردۆتەوە ، بەڵام بە دوای ئامانجێکی تردا ئەگەڕێن ، بەرامبەر تایبەتی و نهێنی خۆیان ، لە پێش بەرژەوەندی میللەتانی جیهان دائەنێن ، بەتایبەتی ڕووەو وولاتانی ئیسلامی ، ئەوەی بە کەڵکە زۆربەی ئەشارنەوە و ، بەرنامەی فەسادی جۆراوجۆر پەخش ئەکەن ، لەسەر هەندێ کەناڵی ئاسمانی تایبەتی ، کە ڕاستەو خۆ پەخشی بەرنامەکانیان ، ڕوی کردۆتە وولاتانی ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست و ، نایانەوێ ڕەوشت و داب و نەریتی ئیسلامی و ، جوامێری مەردایەتی و گیانی هاوکاری و یارمەتی دان ، لەناو خەڵکی دا بمێنێ و ، بەهاوکاری هەماهەنگی ، لەگەڵ بەشەکانی تری هۆکاری بلاوکردنەوەی دەنگ و پەڕاوەکانی تردا ، بەرەو ئامانجە نهێنی و خراپەکانیان هەنگاو ئەنێن ، جگە لەوەی کە هەوڵێکی بەردەوامی داگیرکەرانی وولاتە ئیسلامیەکان هەبوو ، بۆئەوەی ڕابوردوی مێژوی ئیسلامی ، لەبیر موسوڵمانەکان بەرنەوە ، کەس لەبیری نەمێنێ کەشانازی بە ڕابوردوی خۆیەوە بکات ، ئەو هەموو مێژووە زێرینەی کەبەدڵ و گیان و خوێن تۆماریان کردبوو ، یان لەبیریان بەرنەوە ، یان بێ بایەخ بێت لەبەرچاویان ،

وە فیکرەی مەبدەئی جیهادی ڕاستەقینە ، لەمێشکی ئەو خەڵکەدا بسڕنەوە و ، خۆ تەسلیم کردن و چاو لێ کەری تەواو ، بۆ هەموو داب و نەریتەکانی دەوڵەتانی ڕۆژئاوا ، بکرێتە بەدیلی ژیوار و شارستانیەتی ئیسلامی .

لێرەدا دەوڵەتی بریتانیا ، دوای شکستی یەک لە دوای یەکی شەڕی ڕوبەڕوی خاچ پەرستان ، لەگەڵ موسوڵمانەکاندا ، جگە لەوەی کەسەرنەکەوتن، گیانی جیهاد و بەرگری و ئیمان و ئیرادەی بەهێزیان بتەو تر کرد لەمیانی موسوڵمانەکاندا ، کە بە هاوڕازی و هەماهەنگی ، ڕوبەروی هێرشی خاچ پەرستەکان بوونەوە ، بۆ یە دڵنیا بوون ، کەئەو شێوازە سەرکەوت و نابێ و ، ئەبێ شەڕی ڕوبەڕو بگۆڕنەوە بە شەڕی ناوخۆیی و ، لە ناو خۆمان فوازو مەترسیمان بۆ دروست بکەن .

٧ .... بۆیە کۆمەڵی وەهابی یان دروست کرد ، ئامانجەکانی خۆیانیان پێ هێنایەدی کەهەندێکیان بریتی بوون لەم خاڵانەی خوارەوە ..

أ ) پچڕانی موسوڵمانان لە ڕابوردووی خۆیان و ، لەبیر کردنی کەسایەتی و تواناو باری کۆمەڵایەتی ئەوەکانی پێشوو .

ب ...سەیرکردنی کەسایەتیە ئاینی و زانستی یەکان ، بە چاوێکی بێ ڕێزەوە ، کە نرخ و بەهایان لەبەر چاو کەسدا نەمێنێ و ، موسوڵمانان والێ بکەن ، کە ئیتر هیچ پەیوەندیەکیان بە زاناو پێشەواکانیان وە نەمێنێ .. چونکە ئەگەر توانیان بگەنە ئەم قۆناغە ، ئەشتوانن وایان لێ بکەن ، لە هەندێکی زۆری پەیڕەو و بەرنامەی ئیسلامی واز بهێنن و ، لێ ی دوور بکەونەوە .

ج ... گرنگ ترین خواستی دوژمنان ئەوە بوو ، کە پەیوەندی میانی میللەتان و خاک و ئاوو وولاتیان بپچڕێنن ، بۆ ئەوەی هەرکاتێ ویستیان ئەو جۆرە خەڵکانەی کە بونەتە گوێ لە مستی بێ بڕواکان ، بیانکەن بە داردەستی خۆیان ، بۆ لێدانی میللەتانی چەوساوە و ، بەر هەڵستی کردنیان و ، زیاد کردنی دوبەرەکی و جیاوازی لە میانیاندا و ، بتوانن بەکاریان بهێنن .

د .... ڕێبازەکانی سەر بەسەلەفیەت چەندەها لقو پۆیان لێ بویەوە ، هەندێکی بەناوی ئیسلاح و چاکسازی یەوە ، هەندێکیشی بەناوی پارێزگاری لە بەهاو بەرنامە پێشووە کان و ، ڕاوەستان لەسەریان بێ زیادو کەم کردنی ، چالاکیان ئەنجام ئەدا ، لەهەندێ لاوە خزمەتیان بە ئیسلام کرد ، بەلام زیانیان زیاتر بوو لە قازانج ، چونکە هۆکارێکی بەردەوام و حازر بەدەست بوون ، بۆ سەنگەر گرتن لەموسوڵمانەکان ، لە هەر کات و ساتێکدا دوژمنان بیان ویستایە ..

چی لەوە گرنگ ترە ، کەفتوایان پێ بدەن ، زیاد لە(٦٠٠) ساڵە موسوڵمان نەماوە و هەمووی موشریکن و ، پێویستە دیسان بکرێتەوە بەموسوڵمان .. چی لەوە گرنگترە ، کەواز لە جیهادو ڕوو بەڕوو بونەوەی کافرو بێ بڕواکان بهێنن و بە ڕبینە گیانی لاوازی موسوڵمانە هاوڕازەکانی خۆیان ..

چی لەوە گرنگترە ، کە زۆربەی ئەوانەی کە بەناوی دینەوە نە جوڵاونەوە ، ڕاستەوخۆ دەبوونە هاوحیلفی ئەو دەوڵەتانەی کە تیایدا ئەژیان ، بۆسەرکوت کردن و بە گژا چوونی ئەو میللەت و کۆمەڵانەی ، کەداوای ئازادی و مافی خۆیان دەکرد ...

جگەلەوەش کەباسمان کرد ، لەسەرانسەری وڵاتانی دونیادا ، ئەوانەی کەدروشمی سەلەفیەتیان بەرز کردەوە ، پێش هەموو شتێک شەڕیان ڕاگەیاند لەگەڵ موسوڵمانەکاندا..

هەرگیز بیریان لەوە نەدەکردەوە ، دژ بەپلان و نەخشەکانی خاچ پەرست و ماسۆنی ودارودەستەکانیان بوەستن ..

هەرگیز نەبونەتە هاوڕازو هاوکار ، بۆڕزگار کردنی موسوڵمانانی فەلەسطین وجیهاد کردن دژ بە جولەکە ، لەوانەیە یەکێ لەمەرجەگرنگەکانی بوون و هاوکاری یان ئەوە بوو بێ ، کەدژ بە پلان و نەخشەکانی جولەکە نەوەستن ، وە لە هیچ وڵاتێکی ئیسلامی دا هاوکارو پشتگیری گەلانی ئازادی خواز نەکەن ..

ئەمەی کەباسی دەکەین ، نمونەیەکی کەمی ئاسایی یە ، بە نیسبەت کە سانێکەوە کە هەوڵیاندا ، کەسایەتی و ڕێزو پیرۆزی و بەهای حەزرەتی پێغەمبەر ﷺ لە دڵی مسوڵمانانداهەڵبکەنن وبیسڕنەوە ، ئەوەی مێژوی ئیسلامی خوێندبێتەوە ، ئەزانێ چ کارەساتێکیان دوچاری موسوڵمانان کردو ، چۆن ساڵە هایەکی بەردەوام ، ڕەوزەی پیرۆزی حەزرەتیان (ﷺ) کردە جێگای بەستنەوەی وڵاخ و ئەسپەکانیان و ، بە پەنجەرەی مەرقەدی پیرۆزیدا ئەیانبەستنەوە ..

ئاسەواری زۆربەی زۆری ئەصحابی کیرام و ، گومەزو شوێنەوارە پیرۆزەکانیان نەهێلاو سارایان کردن و ، بەناوی دڵسۆزی یەوەبۆ ئیسلام ، هەوڵیاندا لەڕەگ و ڕیشالیان دەربهێنن و سەروینی بکەنەوە ..

هەرچەندەئەم پێشەکی یە ، جێگای ئەوەنی یە ، کەباسی چۆنیەتی دروست بوون و دژایەتی یان بکەین ، لەگەڵ موسوڵمانانی ئەهلی سوننەت و جەماعەتدا ، بەلام ئەم کورتە باسە پێویست بوو ، تا ئەوەی دەرفەتی لەبار ئەڕەخسێ و ، زیاتر موسوڵمانان لێیان حاڵی ئەبن و ، لە مەبەستی شاراوە یان ئاگادارئەبن ....

٨ .... وەک لە دوتوێی ئەم پەڕاوەدا بۆت دەردەکەوێ ، هەندێ بزوتنەوەی ئیسلاحی پەیدابوون ، بەناوی دژایەتی لەتەک خەرافیات و بڕوای پوچەڵ و ، دورکەوتنەوە لەڕەمز و پەیکەرو شەخس پەرستی ، بەڵام لەڕاستیدا ئەمانیش خراپکاری یان زیاتر بوو لە چاک سازی و ، بیانەوێ یانەیانەوێ ، بوونە پێشڕەوی قافڵە ، کەلە ڕێگەی ئەوانەوە دوژمنانی ئیسلام ، ڕێگەی غەزوی فیکری و سیاسی یان بۆناسان ببێت و ، موسوڵمانان بدەن بەگژ یەکتر یدا و ، دوولەتیان بکەن و ، خۆیشیان خێر و بێری وولاتەکانیان دابەش بکەن ، بەداخەوە زۆربەی مەبەستەکانی ماسۆنیەتی جیهانی و ، مەحفەلە دامەزراوەکانیان ، لەبزوتنەوەی چاکسازی محمد عەبدەو ئەفغانی و ، دواکەوتوەکانیاندا ڕەنگی دایەوە ، ئەمانە ناوی خۆانیان نا سەلەفی و ، وەهابیەکانیش خۆیان خۆیان بەوناوە ناساندوو ، هەندێ جار لەسەر ناوەکە ، شوێنکەوتوانیان ئەبوو بەهەرایان و ، لەسەر ناوەڕۆکیش زۆر ڕانەدەوەستان ، کەئەمەش دیراسەو ڕونکرنەوەی زۆری ئەوێت ..

سەلەفیەتی ئێستا زۆر لەوکاتە خراپترە ، کەناوی لێ نرا ، چونکە لەسەر بنەماو پەیڕەوێکی تایبەتی ناجوڵێتەوە ، بەرنامەی زانستیان دانەرێژاوە کەپابەندی لێ بکەن ..

یەکێکیان نی یە کەببێتە ئیمام و ، پلەو مەرجەکانی ئیجتیهادی تیادا هاتبێتە دی ، کە شوێن کەوتوانی بێ دوو دڵی شوێنی بکەون ...

پابەند نین بەمەزهەبێکەوە ، لایان وایە موسوڵمان ئەتوانێ ڕاستەو خۆ حوکمی شەرعی لە کیتاب و سوننەت وەربگرێ و ،ئیتر پێویستی بەو چوار مەزهەبە نی یە ..

سەلەفیەتی ئێستازیاتر لە بەناوسەلەفیەتی جاران ، ڕابوردوو لەبیری نەوەی تازەئەبەنەوە ، مێژووی ئیسلامی لەبەرچاوی شوێن کەوتوانیان لەکە دار ئەکەن ..

سەدان فەرمودەی حەزرەتی پێغەمبەر ( ﷺ ) لەگەڵمیزاج و بۆچونی ئەواندانەگونجا ، بەلاوازو و دانراو لەقەڵەمی دەدەن و باسی دەکەن ..

جگە لەوەی کە صەلاواتی دوای بانگ و ،مەولود نامەو میعراج نامەی پێغەمبەر و ، یادی ئەصحابی کیرام و ئەولیا بەرزەکان و ، زیارەتی مەر قەدی پیرۆزیان ، بەشیرک وگوناهی گەورە ئەزانن و ، دەڵێن ( فاتحە ) ناڕوات و ، هەڵسان لەبەر گەورە تاوانە و ، پەنا بردن و هاوار کردن لەپێغەمبەری خودا ( ﷺ ) ئەوەشیرکە ... تاد .

٩ ... سەلەفیەتی ئەمڕۆ ناوی زلەو دێی وێرانە !! کاتی خۆی موعتەزیلەکانیش ناوی خۆیان ناو نابوو بە ئەهلی تەوحیدو ، خەواریجەکانیش دەیان ووت : ئێمە خروجمان لە باتیڵ و ناڕەوا کردووە ، هەقەکانیش دەیانووت : ئێمە (اهل اللـه) ین و ، خەڵکی تریش خۆی بە ( شعب الله المختار ) ناو ئەبردوو ، کۆمەڵێکی زۆری تریش کلیلی بەهەشتیان

دابەش دەکردو ، خۆیان بە (رضوان) ی دەرگاوانی بەهەشت دەزانی ..
کەواتە .. خوای میهرەبان سەیری نـاوو شـێواز و پـڕو پاگـەندە ناکـات ، بـەڵکو سـەیری نـاوەڕۆک و حەقیقەتی نـاو دڵـی ئەو کە سـانە دەکـات ، کەناوی خۆیـان ناوەموسـوڵمان ، ئەگەر پیاو چاکان بە موشـریک بزانـن و ، ئەهلی تەریقەتـەکان بـە گومـڕا لـە قەڵـەم بـدەن و خۆیشیان دوربن لەعیبادەت و خودا ناسی ، تەنها قسـە بکـەن و قسـەبزانن و ، گرنگی بـە کارو کردار نەدەن ، گوێ نەدەن بەوەی کە خودای گەورە دەفەرموێ (وقـل اعْمَلُـوا فَسَـيَرَ اللَّـهُ عَمَلَكُمْ وَ رَسُولهُ والمؤ منُون ) ئیتر گلەیی لەکەس نەکەن ، چونکە خودای گەورە بە جوانـترین شێوە ئـەوانی دروسـت کـرد (لَقَدْخَلَقْنَـا الإنْسَـانَ فِي أحْسَـنِ تَقْوِيْـمْ ) بـەڵام خۆیـان خۆیانیـان بەردایەوە بەرەو هەزار بەهەزاری بەدبەختی و چارەڕەشی ... (ثم رددناه أسفل سافلین ).
بەداخەوە ئەوەی ئەمڕۆ دروشمی بەناوسەلەفیەت وچاکسـازی هـەڵگردووە ،ئیـتر عیبـادەت و پاک سازی دڵ و دەرون بەکاری خۆی نازانێ ...
بەلایەوە ڕەوایە پەنا بەرێتە بەرهـەمەرو وولات و ڕێـک خراوێـک ، بـۆ پـارەو دەسـتکەوت و دۆلار ، بـەڵام بەلایــەوە شـیرکە ، دوای نوێژەکـان نیـو کـاژێر دابنیشـێ و ، خـەریکی تەسبیحات و سەلاوات بێت ..
بەلایـەوە ڕەوایـە هـاوار بـەرێت بـۆ دەسـتەلاتـدارانـی دونیـا ، کـە فریـای بکـەون !! بـەڵام بەلایەوە کوفرە ،کە هاوار بەرێت بۆ حەزرەتی پێغەمبەری خودا (ﷺ)کە فریای بکـەوێت لـە ڕوی تەوەسول بەزاتی پیرۆز یەوە ..
بەلایەوە ئاسایی یە ، کە بە فـەرمودەی حـەزرەت بڵێـت : لاوازە و بـێ هێـزەو دروسـتکراوە (موضوع)ە نادروستە !! بەڵام هەرگیز نـاوێرێ بەرامبـەر دەسـەلاتدارێک کـە بەتـەمای خێـرو بێری ئەو بێ ، قسەکانی بەدرۆ بخاتەوە ، یان بەر هەڵستی بکات .!!
بەلایانەوە ڕەوایە کەدەیان نازناوی وە ک : (صـاحب الجلالە ، سید ) گەورەو ، فەخامـەت و مـەولانا بەکاربهێنێت ، بۆ مـەلیک و دەستەلات دارانی دونیا ، بـەڵام بەلایانـەوە شیرکە کەبەحەزرەتی پێغەمبەرو هاوەڵانی بووترێ (سَیِّد)..
کەناوی گەورەیەک یان مامۆستایەکی خۆیان دەبەن ، بـەرێزەوە چـەندەها نازنـاوی بـۆ بـاس دەکـەن و ، بـە چـەندەهادێڕ سـەناو پیاهەڵدانـە وە تـاریفی دەکـەن ، ئینجا بەئەدەبـەوە نـاوی دەبـەن ، بـەڵام نـاوی حـەزرەتی پێغەمبـەری خـودا ( ﷺ) دەبـەن و ، زۆر بەئاسـایی و بـێ ئەدەبی یەوە ئەڵێن : موحەممەد ووتی ، ئەبوبەکر وای کرد ، عومەروارۆیشت ..

ئەگەر دەوڵەمەندێ یان کاربەدەستێکی گەورە ، بچێ بۆلایان ، پێشوازی لێ دەکەن ، پێشتر هەڵئە ستن و ڕوبەڕویشی ئەڕۆن و ، دەستی بەسنگەوە بۆئەگرن !! بەڵام ئەگەر موسوڵمانێک لەبەر زاناو پیاو چاکێ هەڵبستێ ، بەحەرامی ئەزانن و ڕێگایان لێ ئەگرن ، ئەڵێن نابێ لەبەر کەس هەڵبستن و لە شیرکەوە نزیی ئەکەنەوە !!!!

١٠ .... خوێنەری بەڕێز:ـ ئەگەر سەلەفیەت مەزهەب بوایەو ، ئامانجی شوێن کەوتنی سەلەفی سالح بوایەو ، بە چاوی ڕێزو بە هاوە سەیری ڕابردووومێژوو ئەصحابی کیرام و ، ئەولیا وپێشەوایانی ئەهلی فەرموودە و فیقهو زانستی یە ئیسلامییەکانیان بکردایە ، ....

ئەگەر سەلەفییەت ؛ هەوڵی چاکسازی ڕاستەقینەی بدایە و ، برایەتی و موحەببەتی بخستایەتە میانی موسوڵمانەکانەوە ، تایەکرێزو هاوکاربونایە ..

ئەگەر سەلەفیەت ، خەمی بۆ داهاتوی ئیسلام و کێشەی میللەتانی ئیسلامی بخواردایەو ، هەوڵی ڕزگار بوونی میللەتانی چەوساوەیان بدایە ، لە دەستی دێوەنەگریسەکانی چواردەورمان ، کە هەمیشە تینوون بەخوێن و خێراتی گەلەکەمان ..

ئەگەرسەلەفیەتێ وولاتی کوردوستانی خۆیشمان ، هەندێ لە چالاکی و مەرامەکانیان بۆ کورد بوایە و ، لە ڕوانگەی ئاینی پیرۆزی ئیسلامەوە ، سەیری کێشەی کورد و دۆخی کوردوستانیان بکردایە ..

ئەگەر لەجیاتی ئیستیرادی فیکرەو بەرنامەی دەوڵەتە خلیجیەکان ، بەرگری یان لە ئیسلامی ڕاستەقینەی خزمەتکراوی وولاتی خۆمان بکردایە ...

ئەگەر کار و چالاکیەکان ، بۆ خزمەتی ئامانج و مەبەستە ئاشکرا و نهێنیەکانی دەوڵەتانی دوور و نزیک نە بوایە ...

ئەگەر ڕاستیان بکردایە لەگەڵ کێشەی کورددا .. ئێستانا کە جادەکەی پانە و ، هەموو کەس بانگەشە بۆ کوردایەتی دەکات ..!! بەڵکو لەو کاتەی کە بەناو ئەنفالی بەدناوو ، کیمیابارانی شارەکانی کوردوستان و ، ئاوارەو دەرکردنی سەدان و هەزاران کەس لە شوێن و جێگاکانی خۆیان ئەکرا ، لە کاتێکدا کە بزوتنەوەی ڕزگاری خوازی کورد ، لە ئەوپەڕی سەختی و تاڵی ژیاندا ، بەرگری لە کێشەو دۆزی کورد دەکرد ، لە کاتێکدا کە خەم خۆرانی کورد ، پێویستیان بە گچکە ترین هاوکاری بوو ، کە هەر ڕێکخراوو خێرخوازێکی ئیسلامی ، پێشکەشیان بکردایە ، یان لەدەوڵەتەکانی تر ، هاو خەمیەکی خۆیان بۆ موسوڵمانانی ژێر چەپۆکی زوحاکی ئەم سەردەمە ڕابگەیاندایە ، یان ئەو کاتە بەزەییان بە منداڵە هەتیوو بێ باوکەکاندا بهاتایەتەوە ، کە لە ژێر چادرەکاندا ئاوارە بوو بوون ، یان لە وولاتی غەریبی دا سەری خەفەتیان دەنایەوە ، یان لە نوگرە سەلمان و بەر ووشتر و

جێگاکانی تر ، چنگوڵی مردن و ، ژاری دوپشکی دەشتە ووشکەکان ، هەرەشەی مان و نەمانی تۆ قیتەری لێبەکردن .

بائالەوکاتەدا ، خەمخۆرەکانی دۆزی ئیسلامی ئێستا ، خۆ هەر لە مەیدانی کاردا بوون با هەڵوێستی خۆیان بە کردار ، ڕابگەیاندایە ، کە بەداخەوە هەڵوێستیان نەبوو ، یان لەوانەیە بڵێین هەندێ لە دەوڵەتە عەرەبیەکان کە ڕازی بوون ، کورد زیندە بەچاڵ بکرێن ، لە خاکی ئەواندا ، رەنگە لەرێگەی ئەم جۆرە ئیسلامیانەوە باسی کوردیان بۆ کرابێت ، بۆیە ئەوانیش بەزەییان پێماندا نە ئەهاتەوە ..

بالەو کاتەدا بەرنامەی ژیانی سیاسی خۆیان بگۆڕیایە ، کە بچونایەتە ڕیزی نەیارانی ئەو دەو لەتانەی کەلە ناویاندا ژیانیان بەسەر دەبرد ، کەبەداخەوە ..!!

ئەوانەی هەو لی چاکسازیان داوە ، زۆر بەی کارەکانیان دژ بە غەیری ئەو دەوڵەتانەبووە کە خۆیان تیایاندا ژیاون ...

وەک ئەوەی کابرای دەوڵەمەند لە شارەکەی خۆیدا خەڵکێکی زۆری هەژار هەبن ، بەڵام زەکاتیان پێ نەدات و ، بروات بۆ وولاتێکی دوور بۆ کەسانێکی تری سەرف بکات ، کە ئەمەش لە ڕوانگەی ئیسلامەوە کارێکی نا بەجێ یە و ، کورد واتەنی : خێر بۆ خوێش وەک فەرمویانە : (الاقربون أولی بالمعروف ).

١١ ... ئەگەر موسوڵمانە خەمخۆرەکانی ئەمڕۆ ، خەمەکانیان بۆ سالآنی پێش ڕاپەڕین بگەڕایەتەوەو ، هەڵوێستیان دژ بەخودی موسوڵمانانی چواردەوری خۆیان نەبوایە ... ئەوا نەک جارێ ، بەڵکو هەزاران جار ئێمەی موسوڵمانی کورد منەت باری قسەیەکی خێرو ئامۆژگاریەکی چاک و ، لاکردنەوەیەکیان نەبووین ، کە بۆ دین و ژینی ئەم میللەتە قازانجی هەبوایە ...

بەڵام ئەگەر ، وەک هەندێ کوردی ئەودیوو ئەیان ووت : ئەگەر شا ڕازی نەبێت ئێمە چەک هەڵناگرین ..!!! جا کە شا خۆی ئەمری کرد ئیتر منەتی ئەو کارمەندە چی یە ... !

بەبڕوای من ئەوەی پێش سالآنی ڕا پەڕین ، نەیتوانی بێت باسی ئیسلامەتی و کوردایەتی پێکەوە بکات ، ئەمڕۆیش قسەی لێ وەرناگیرێ ..

ئەوەش کەنەیتوانیبێ ، باسی کوردایەتی و ئیسلامەتی لە پاڵ یەکدا بکات ، ئەمڕۆش قسەکانی بۆ سیاسەتەو ، نە دینداریەکەی ڕاستەو ، نە کوردایەتیەکەی دروستە .

ئەوەی سالآنی پێش ڕاپەڕین ، ئەگەر دژ بە ڕژێمی بەدناو نەبوو بێ ، ئەمڕۆ سنگ دەرپەڕاندن دادی نادات و ، قسەش بکات ئەو کاریگاریەی نابێت ... ئەوەی بەناو خزمەت بە هەموو موسوڵمانانی جیهان بکات ، بەڵام چاوی هەژارو دەربەدەرو ، ئێش وئازاری نەتەوەو میللەتەکەی خۆی نەبینێ ، ئەوە چەندە بۆ دەورو بەرەکەی ڕاست ئەکات

هەر ئەوەندەش لەگەڵ خەڵکانی تردا ڕاستی کردوە ..
ئەوەی فرمێسک بۆ میللەتانی ژێر دەستەی وولاتانی ئیسلامی ئەرێژێ و ، بەچاو قایمی و دڵ ڕەقیەوە ، ئەینوارییە ئاهوو ناڵە و فرمێسک و گریانی هەزاران منداڵی بێ باوک و پیرەژنی بێ ئاگردان و ، پیاوی ڕدێن سپی بێ لانە ، وە هەرگیز بەزەیی بە موسەڵمانانی ژێر دەستەو ، هاوولاتیانی چواردەوری خۆیدا نە ئەهاتەوە ، ئەوە نەگریانەکەی ئەوکاتەی ڕاستە و ، نە پێکەنینەکەی ئێستای ، کە هەندێکیان بۆ مەرامی سیاسی ئەندازەیە بە پێکەنینێکی دروست کراوەوە دێن بە دەمتەوە ، کە فریوت بدەن و بۆ لای خۆیان ڕات بکێشن ..
١٢ .... لەناوکوردستاندا سەدان مزگەوت و خانەقاو مەدرەسەی ئاینی هەبووەو ، هەزاران فەقێ و مەلایان تیا دەر چووەو ، هەرگیز ڕۆژێ ئەهاتۆتە پێشەوە ، کە کوردوستان بێ مە ڵبەندی زاستی و ئیسلامیەتی بوو بێت ، کەواتە نابێ ئەمڕۆ باسی ئەوە بکرێت کە خودا فریشتەی ڕەحمەتی ناردووەو ، تازە خەڵکی موسوڵماڵدەکەن .. مەدرەسەی ئاینی لە کوردوستاندا هەرگیز پێوستی بە ئیزنی کەس نەبووە و ، لەسەر شانی خەڵکی موسوڵمانی کورد بووە و ، بەڕاتبەو دەقنە و هاوکاری موسوڵمانانی کورد ، مەدرەسەو حوجرەی مزگەوتەکان بەرێوە چوون ، ئیتر پێویستی بە دەفتەرە دۆلاری وولاتانی ئیوە دوورگەی عەرەب نەبووە ...
تەنانەت لە کاتێکیشدا کەرژێم ، بەئاگرو ئاسن بەربوبوبە مزگەوتەکان و ، گوندەکانی دەروخاندو مزگەوتەکانی ژێراو ژوورەکرد ، ئەوکاتەیش زۆر لە زاناو پیاوچاکانی کوردوستان ، بە دلێری و ئازایەتی و بەرچاو تێری و ئەترسی یەوە ، دەرسی حوجرە کانیان ئەئەفەوتاندو ، دەیان فەقێیان پەروەردە ئەکرد .. کەتاقە یەک لایەنی سیاسی ئیسلامی لەو کاتەدا نەیئەوێرا ، نەک بەناوی سیاسەتەوە ، بەڵکو بەناوی ئاسایی تەدریس و فەقێ ڕاگرتنیشەوە ، خەڵکی لە بەر خودا پەروەردە بکەن و ، فێری زانست و مەلایەتیان بکەن چونکە ڕژێم تا بۆی بکرایە نا ڕازی بوو ، بروا داری دەویست کە خۆی ڕابگرێت بەرامبەری .
زۆر لەوانەی ئەمڕۆ چاکسازی ئەکەن ، ئەوکاتە نەیان دەوێرا ڕوبەڕوی ئەو مەترسی و سەختی یە ببنەوە و ، بەر پەرچی سیاسەتی ڕژێمەکانی دژ بە ئیسلام و کوردایەتی بدەنەوە .
١٣ .... ئەمڕۆ زۆر باسی ئیسلامی سیاسی دەکرێت ، وەک ئەوەی کە سیاسەت لە موسوڵمان حەرام بێت .!! یان ئیسلام سیاسەتی تیانەبێت ، کە هەردوو لێکدانەوەکە بەڕای من کەم و کورتی تیادایەو ، بەڕواڵەتی سەیری مەسەلەکان دەکرێت و ، نا یانەوێ بگەنە بنج و بنەوانی بابەتەکان ..چونکە ئەوانەی ئەمڕۆ بەناوی ئیسلامەتیە وە کاردەکەن

و ، بەرنامەو پەیڕەوی سیاسیان بۆ خۆیان داناوە ، هەرگیز لەناو خۆیاندا سڵیان لەوە نەکردۆتەوە ، کە پێیان بووترێ سیاسی ، بەڵام نەیان ویستووە لەناو جەماوەرێکی ئاسایی دا ، بەوناوە بانگ بکرێن و بناسرێن ، ویستویانە سیاسی بن و ، بابەتەکەش بکەن بە ژێر کەرە گەڵاوە ...!!

ئێستایش نکولی لەوە ناکەن کە سیاسین ، بە ڵکو رایان گەیاندووە کە هەوڵی چاکسازی نەدەن و ، بەبەر نامەوە کارەکانیان ئەنجام نەدەن و ، بەرەو ئامانجێکی تایبەتی و ، بۆ سەرکەوتن و گەیشتن بەهیوا نەڕۆن و ، ئەگەر دەسەتەڵاتیان هەبێت هەرگیز پاشەکشە لە هەڵوێست و بۆ چونەکانیان ناکەن ، تا ئەم خاڵە یە ، کارێکی نابەجێیان نەکردووە ، بەڵام هەندێ خاڵ هەیە ئەگەر تیایاندا بوایە ، دەرفەتی لە بارتری پێ دەبەخشین ، بۆ پێشکەوتن و ، ڕاستی و دروستی قسەو دروشمەکانیان ، وەک ئەو خاڵانەی کەباسمان کرد ، کە خۆزگایە لەوکاتەوە موسوڵمانی کورد ، پێویستی بە بەرگری و هەڵوێست و جوامێری هەبوو ، سیاسەتمەدارانی ئیسلامی کوردیش ، لە ڕوانگەی خزمەت بە ئیسلامەوە خزمەتیان بە گەلە کەشیان بکردایە و ، لە تەنها تەنگانەیەکدا هەڵوێستێکیان تۆمار بکردایە ، یان جەختیان بکردایەتە سەر ئەو ڕێکخراوە گشت گیرانەی ، کە لە جیهانی ئیسلامی دا بەناوی ئیسلامەوە کاریان ئەکرد ، کە بۆیەک جار بەرنامەی مەزلومیەتی نەتەوەی موسوڵمانی کورد ، لە کۆڕو کۆبونەوەو ، کۆنگرەیەکی خاوەن بڕیاردا ، باسی لێ وە بکرایە ، بەڵام بەداخەوە نەکراو ، هیچ پاساوێکیش ئەو کەلێنە پڕناکاتەوە ....

دیسان دەیڵێینەوە کە سیاسەت لە موسوڵمانی کورد حەرام نی یە ، بەڵام ئەوەی لێ ی حەرامە خۆیانی لێ نادەن و باسی لێوە ناکەن .

١٤ .... ئەگەر هەموو کورد ببێتە سیاسەتمەداری ئیسلامی و ، هەموو موسوڵمانێکیش ببێتە سەرچاوەی سیاسەت و پەندیاری ، لە کارو فرمان و ڕێنمایی و ئیدارەو ڕێڕەوی ژیاندا ، کوردو کوردوستان هیچ زیانێکی بەر ناکەوێ ، وەئیسلامەتی ڕاستەقینەیش هیچ کە لێنێک ڕوی تێ ناکات و ، هیچ گەردێکیشی پێوە نانیشێ . بەڵام بابزانین مەترسی و خراپە لە کوێ دایە ...!!!

بۆیە ڕووناکبیر و سیاسەتمەدارانی کورد و میللەتانی تریش ، هەڵوێستەیان بۆ دروست بووە لەسەر ئیسلامی سیاسی ، چونکە هەندێ خاڵیان بەرچاو کەوتووە ، بەپێچەوانەوە تەفسیر ئەکرێت و ، زەمینە خۆش ئەکات ، کە تۆمەتی دروست و ناجۆریان بدرێتە پاڵ ، چونکە بەداخەوە زۆربەی ئەوەی کە بەرچاومان کەوت ، پێچەوانەی ئەو خواست و ئامانجەیە کە ئیسلامی بۆ هاتە کایەوە .. ئەگەر بمانەوێ لە ڕوانگەی ئیسلامەوە ، ئەم بابەتە بە ووردی دیراسە بکەین ، ئەگەینە ئەم ئامانجەی کە بێ سڵەمینەوە بڵێین :-

ئەگەر هەر لاو لایەن و سیاسەتمەدارێکی ئیسلامی ، بۆ خزمەتی سیاسەتی خۆی ئیسلام بەکار بهێنێ ، ئەوە کێشە و گرفتی کورد و میللەتانی ئیسلامی زیاتر و قووڵتر ئەکات ، وە لە ڕاستە شەقامی دەعوەی ئیسلامی ڕاستەقینە لایداوە و ، پێویستە هۆشمەندانە و دڵسۆزانەتر ، بۆ ئیسلام و موسوڵمانەتی بیر بکاتەوە .
دڵسۆزی ڕاستگۆی ئیسلام ئەوەیە :ـ کە سیاسەت بکاتە خزمەتکاری ئیسلام ، نەک ئیسلامەتی بکات بە خزمەتکار و وەسیلەی پێشڕەوی بۆ سیاسەتەکەی خۆی ..!
دڵسۆزی بۆ ئیسلام ئەوەیە : ـ کە ئیسلام سود لە هێز و بازووی ماددی و کەسایەتی و لێبڕان و کەسایەتی ئەو وەربگرێ و ، بە چالاکی خۆی خزمەت بە ئیسلام بکات ، نەک ئەم بەرنامە پیرۆزە بکەیتە وەسیلەی ژیان و ، بەسەر ئیسلامەوە خۆت بژێنیت و بە مەرامی دونیایی بگەیت و ، کەس و کارت لە شوێنە چاکاکاندا دابمەزرێنیت و ،شۆربای نیسک خۆراکی خوارەوە بێت و ، ژیانی ناو کۆشک و تەلارەکانیش هەردەم هاوڕازی یار و نزیکانت بێت .
ئەوەی لە ئیسلامی سیاسی ئەگیرێ ، وەک خاڵێکی ڕەوا کە ئەدرێتەوە بە ڕووی موسوڵماناندا ، ئەوەیە کە : ـ بۆچی هەموو میللەتانی دونیا ، لەپاڵ ئیسلامەتی و موسوڵمان بوونیاندا ، بوونەتە خاوەنی کیان و دەسەڵات و ، ئێمەش بەو هەموو خزمەتەی کە کردمان بۆ ئیسلام ، لێمان حەرام بکەن ، تەنانەت خاوەنی نیمچە کیانی خۆیشمان بێن .. مەرج ئەوە نیە لێرەدا هەرکەسەو بەرگری لە هەڵوێستی خۆی بکات و ، باس لەوە بکات ، کە ئەوەی ئەو بۆ کوردی کردووە ، کەس نەیکردبێت ، گرنگ ئەوەیە جارێک لە ئێزگە و کەناڵەکانی دەنگ و ڕەنگ ، یەکێ لەو هەڵوێستانەمان ببیستایە ، با لەسەر زوبانی موسوڵمانە سیاسیەکانی وڵاتانی دەرەوەش بوایە ، کە بۆ ئەم ساڵانەی دوایی ، ئەبوونە شایەتی ڕەوا ، لەسەر دروستی و ڕاستی هەڵوێستەکانی ئێستا .
١٥ .... ئەبوایە ئەو کاتەی ( ئەریەکان ) لەسەر حوکم بوو ، ئەوەندەی کارێ لێ بکرایە ، کە هیچ نەبێ ، دژایەتی دۆزی ئەتەوەی کوردی نەکردایە و ، ئەگەر ناتوانێ گوڵ بێ با لە عەلمانیە (ئەتاتورکی)یەکانیش زیاتر بۆ مەسەلەی ڕەوای کورد ، درک ئەبوایە وەک ئێستا باسی ئەکەن ، وا بۆ دەیان ساڵە ئیسلامی سیاسی لە کوردستاندا و هەندێ جاریش لەژێر پەردەوە و ، لەپێشتریش هەبووە ، ئەی بۆ نەیانتوانی کار بکەنە سەر موسوڵمانە باڵادەستەکانی میسر و سوودان و پاکستان و جێگاکانی تر؟ کە هیچ نەبێ کورد بە موسوڵمان دابنێن و ، جارێک دژ بە هەڵوێستی ڕژێم بانگەوازێکیان بەرز بکردایەتەوە ، خۆ ئەگەر هیچ کاردانەوەیەکیشی نەبوایە ، دڵمان پێی خۆش دەبوو ، هەستمان ئەکرد کە دڵسۆز و خەمخۆر و هاوڕازمان هەیە و ئێستاش ئەگەر چەندین جاری تر ، خۆیان بە

خاوەن هەڵوێست نیشان بدەن ، بۆیان نەچووە سەر و ، کەس نەیدەتوانی تکوولیان لێ بکات ، بەڵام دیسان بەداخەوە دەڵێم : ئیسلامی سیاسی ئێمە ، نەهامەتیەکەی بۆ خۆمان بوو ، خێرەکەیشی بۆ میللەتانی تر ، یان ڕاست تر وایە بڵێین : بۆ حوکمڕانی وولاتی تر ..!

چونکە لەلایەکەوە میللەتی کوردی لەیەک جودا کردەوە ، گوایە کۆمەڵانێک تەنها بۆ ئیسلام هەوڵ ئەدەن و ، کۆمەڵانێکی تریش بە مەبەستی نەتەوایەتی و ئایدۆلۆژی و فیکرە جیاجیاکانی تر .

ئەوەش کە بۆ ئیسلامی هەوڵ ئەدا ... بەرنامەی کاری بۆخۆی دانا ، ئەوەی لەژێر دروشم و بەرنامەکەی ئەودا جێگەی نەبوویەوە ، ئیتر بەدبەخت ئەکرا و ، لە دائیرەی فراوانی ئیسلامیش وەدەر ئەنرا ، کە ئەمە سەرەتای پیاهەڵگژان و لێک ترازانی موسوڵمانان بوو بەرامبەر یەکتری ..

لەپاشان چەندەها فیکرە و بۆچوونی تری ئیسلامی دروست بوون ، هیچیان دانی خێریان بەوانی تردا نەدەنا و ، هەموویشیان ئەگەر لێیان بپرسی ، تەنها خۆیان بە فیرقەی (ناجیة) و کۆمەڵی سەرفراز و ڕزگاربوو ئەزانن وتوهمە و ناو ناتۆرەی خراپیش ، ڕوویەرووی تاقمەکانی تر ئەکەنەوە .

لەوە خراپتر ئەوەبوو ، کە ڕازی نەبوون کەس سەربەخۆیی و بێ لایەنی خۆی ڕابگەیێنێ ، وەک ئەوەی کلیلی دەرگای ئیسلامەتی بەدەست ئەوان بێت و ، ئەگەر غەزەبیان لە هەرکەس گرت ، ئەوا دەری بکەن و دووری بخەنەوە .

• لێرەدا ئەبێ ئەو ڕاستی یەش بڵێین : ـ کە خەڵک بەگشتی حەزیان لە سیاسەت نیە ، بەڵکو زۆربەی زۆری لێی بێزارن و ، تا بتوانن توخنی ناکەون ، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێ کە حەزیان لە ئیسلامەتی و کوردایەتی نیە ، بەڵکو موسوڵمانیشن و ، خۆیان بە شوێنکەوتووی پێشەوا و ڕابەرە مەزنەکانی گەل و وولاتەکەیان دەزانن ، کە سەدان ساڵ لەمەوبەر ، دەیان جار زیاتر لە ئێستا ، خزمەتیان بە ئیسلام کردووە و ، سەرمەشقی پێشڕەوی کوردایەتی و بەرگری لە مافی گەل و نەتەوەکەشیان بوون .

کەواتە : کاتی ئەوە هاتووە کە بڵێین :ـ

بەداخەوە ، سیاسەتی نادروست ، ئیسلامی لە سیاسەت دوور خستەوە و ، کوردی کردە نەیاری ئیسلامی سیاسی .. ئەگینا سەرکردە مەزنەکانی وەک ( صلاح الدین ی ئەیوبی شێخ سەعیدی پیران و شێخ عبدالسلام ی نەقشبەندی و شێخ مەحمودی مەلیک و قازی محەممەدی شەهید و مەلا مصطفی ی بارزان ) ، ئەمانە هەموویان سیاسەتمەداری کورد

بوون و ، مەشرەب و ڕێبازیان طەریقەت و تەصەووف بووە و ، لەڕێگای عاریف و خواناسانەوە ، بە پەیڕەوی لە نەقشەبەندی و تەریقەتە پیرۆزەکانی تر و ، بە پابەندی لەسەر ڕێبازی ئیسلامەتی ڕاستەقینە و ، لانەدان لە مەزهەبی ئیمامی شافیعی .. خ ..
ئەمانە جوامێر و خەباتگێڕ و کوردپەروەر و ، سیاسەتمەداری ئیسلامی بوون ، خزمەتی ئیسلام و کوردستانیشیان کردووە ، سەرکەوتبێ یان نا ، کەس گلەییان لێ ناکات و ، تا کورد مابێ ، منەتباری هەڵوێستی ڕاست و دروستی ، ئیسلامەتی و کوردایەتی ئەو پێشەوا مەزنانەیە ، بەڵکو میللەتانی تری ئیسلامیش ، لێیان مەمنوونن و ، بە ڕێز و بەها و قەدر گرانیەوە ، سەیریان ئەکەن ، چونکە ئەزانن ئەوانە ڕاستیان کرد لەگەڵ نەتەوەی خۆیان ، ( کەواتە : ئەگەر بۆیان بکرێت ، خزمەتگوزاری میللەتانی ئیسلامیش ئەبن، وە ئەوانە شیاون کە پێیان بووترێ موسوڵمانی سیاسی و ئیسلامی ڕاستەقینە ) .
١٦ .... ئەگەر چاکسازی ئیسلامی و ، سەلەفیەت و ، هەموو جۆرێکی ئیسلامی سیاسی ئەمڕۆ ، هەوڵدانی ڕاستەقینە بێت ، بۆ یەکگرتنەوەی هەردوو شاباڵی خزمەت بە ئیسلام و وولات و نەتەوە ، لەڕوانگەی بەرنامەی تێرو تەسەل و بێ هەڵەی ئیسلامەتی ، وە گەیشتن بێ بەریزی ئەو کاروانە جیهادیەی کە سەرکردەو ڕابەرانی کوردی ئیسلامی ، لە سەدان ساڵ لەمەو بەرەوە بە ڕێ یان خستووە ، ئەوە کارێکی زۆر چاکەو ، نوێ خوازی و جوامێریەکی ترەو ، کە لێتێکی پێویستی سیاسەتی ئەمڕۆی کورد پڕ ئەکاتەوە ، کە هەتا ماوون ، ڕەحمەت بوییان بکرێت و ، کەمردیشن ئەبنە نەمری ڕاستە قینەو لە دڵی هەمواندا ئەژین ..
ئەگەر هەوڵیان بدایە ، کە دوو بەرەکی و ناکۆکی میانی موسوڵمانەکان بنە بڕ بکەن و ، خۆیان بکەنە سەربازی نە ناسراو ، بۆ بەرگری لە ئیسلام و ، پابەندی بە ڕێبازی سەلەفی صالحین و ، لانەدان لە پەیڕەو کردنی یەکێ لەو چوار مەزهەبە متمانە دارەی ، کە لەلایەن هەموو گرۆی ئیسلامیە وە بەرەزامەندی وەرگیراون ، وە هەوڵ نەدەن کە مەسائیلی لاوەکی و تایبەتی ، بکەنە کێشەو ، خۆیان لە کۆمەڵی موسوڵمانان و ئەهلی سوننەت و جەماعەت جیا بکەنەوە ، ڕێگە نەدەن ، خودا نە خواستە ببنە بەهانەی هێرشی نەیارانیان و ، جێگای ڕەخنەی جەماوەر و ، مایەی دڵخۆشی دوژمنانی کورد و ئیسلامەتی ، وە نەبنە دار دەستی ئەو دوژمنانە بۆ لێدانی دۆزی کورد ، ڕاستە و خۆ ، یا ناڕاستەوخۆ .. ئەوکاتە بەئەرکی خۆیان هەڵدەستان و هەموو کە سێکیش منەتباریان ئەبوو .
١٧ ...ئەوەی پێویستە کۆتایی ئەم پێشەکیەی پێ بهێنین ، ئەوەیە کەنابێ لە هەموو حاڵەتێکدا گوێزلەسەر ، ئەوانە بشکێنینەوە ، کەرەوایە ڕەخنەیان لێ بگیرێ .

پێویستە ئەو ڕاستی یە نەشارینەوە ، کە زۆربەی سیاسەت مەدارانی کوردیش ، بەرپرسی مێژوویی ڕویان تێ ئەکات ، کە بۆچی نەیانتوانی سود لە مێژووی ڕاپەرینی بزاڤی ڕزگاری خوازی کوردی وەربگرن ، کە هەمیشە لە ڕێگەی ئیسلامەتی و نیشتیمان پەروەریەوە ، خزمەتیان بە کوردوستان کردووەو ، بە ئەمانەیش هەردوو لایەنەکەیان وەک یەک بگرتایە و ، لایەنێکیان ئیهمال نەکردایە ..

ئەگەر شانازی بەرابردووی سەرکردەکانیان ناکەن .. ئێمەیش چ گلەییەک لەوانە بکەین کە هەوڵ ئەدەن موسوڵمانان لە رابوردی ئیسلام و ، مێژووە پرشنگ دارەکەی دوربخەنەوە.

ئەگەر ئەو سەرکردە گەورانە بە دڵسۆز نەزانن ، بەڵام لایەنی گرنگیدان بە ئیسلامەتی کەم بایەخ سەیر ئەکەن ، ئەوا هیچ گلەییەک لە کەسی تر نەکەن ، چونکە ئەگەر دڵسۆزانی کورد ، باسی ئیسلام و ڕێبازەکەی پشت گوێ بخەن ، ئەوا بۆشایی یەکی گرنگ دروست دەبێت و ، بیانەوێ یان نا کە سانێکیش هەوڵ دەدەن پڕی بکەنەوە .

ئەگەر بڵێن : ـ ئێمە لەبەر گرنگی دان بەباسی مەسەلەی کوردایەتی ، نامان پەرژێتە سەر خزمەت کردن بەئیسلام و باسکردنی ، ئەوا میصداقیەت لەناو خەڵکدا لەدەست دەدەن ، لەلایەکەوە ڕێگا خۆش ئەکەن ، کە بەدیلیان بۆ دروست ببێ و ، ئەو فەراغە پڕ بکەنەوە ، لەلایەکی تریشەوە متمانەی جەماوەری موسوڵمانی میللەتەکەیان کەم دەکەنەوە ، کە ئایا ڕاستە ئەمانە هەڵگری پەیام و ، میرات گری ڕێبازی سەرکردە مەزنەکانی گەلەکەیانن ....!!

چونکە ئەوان هەرگیز ئەو دوو لایەنە گرنگەی ژیان و دینیان لەیەک جودا نەکردوەتەوە و ، ئەمانیش کە میرات گری ئەسڵی ئەوانن باوەڕیان بەو جیاکردنەوە نی یە.

١٨ .... کەواتە بۆچی پرسیار نەکەین : ـ ئایا سەرکردەکانی وەک شێخ سعید و شێخ عبد السلام ، یان قازی محمد و شێخ محمود ، کەلە پاڵ ئیسلامەتی دا خزمەتیان بە کوردو کوردستان ئەکرد ، ئایا چ گرفت و ناسۆرێکیان بۆ دروست بوو ، لەلایەن زاناو شێخانی ڕاستی تەریقەت و ، گەورە پیاوانی ئیسلامەوە ، ئایا کەس دروست بوو ، بەناوی ئیسلامەوە دژایەتیان بکات ؟؟

ئایا سەرکردەی دڵسۆزی ئیسلام و کورد ، مەلا مستەفا ی بارزانی ، کێ بەناوی دینەوە لە زانایان و سیاسەت مەدارانی کورد ، بەرەنگاری یان لێ کردوە ؟؟!

تاقەمەلایەک بهێنەرەوە بە نمونە ،کەدژایەتی کردبێ و ، کۆسپی بۆ دروست کردبێ ... وە بەناوی دینەوە ، خەڵکی لێ هەڵگێرابێتەوە .

بۆچی کەسی وا دژایەتی نەدەکرد ، لە موسوڵمانە ئیسلام خوازەکان ؟؟ چونکە ئەو سەرکردەیە موسوڵمانێکی سیاسی بوو .. کوردێکی دڵسۆز بەئیسلام بوو ، مەلایەکی

شارەزابوو ، لەسەر ڕێبازی ئەهلی عیرفان و پیاوچاکان بوو ، پەیڕەوێکی ڕاستی نەقشبەندی بووە ، کوردایەتی و ئیسلامەتی لەیەک جودا نەئەکردەوە ، خۆی بانگی زانایانی کوردی دەکرد و ، کیانی بۆ دروست دەکردن ، کە هەرگیز مەلای کورد ، پاشکۆی سیاسەت نەبێت ،بەڵکو سیاسەت مەداران لەسەر ڕێنمایی و تەوجیهی زانایانی ئاینی برۆن بەڕێوە ..

بۆیە ڕازی نەبوو هیچ کەسێ بتوانێ دەست وەربداتە ناو ریزی زانایان و ، سەرپێچی هەبێت لە جێ بەجێ کردنی فتوا کانیاندا ...

بەم بڕیارو پشتگیریە وای کرد لەخۆی ، کەلە مینبەری مزگەوتەکان و ، حوجرەی مەدرەسە ئاینیەکان و ، خەتەی نەقشبەندی و ئەهلی تەریقەت و ڕێبازەکانی خودا ناسین هەموویان بوبوون بە مایەی سەربەرزی و ، ناوداری و پێشکەوتنی کورد و سەرکردەکەیان کە کاردانەوەیەکی وای هەبوو ، کەس بەناوی حیزبی ئیسلامیەوە ، نەیتوانی شەرعیەت بەخۆی بدات ، یان دروست ببێ و کەنە لە کیانی کورد بکات ..!!!

کەواتە ئەبێ ئێمەی کورد ، دڵنیابین کەئیسلام هەرگیز دژایەتی بۆ میللەتی کوردو ئازادی خوازانی جیهان نەبووە و نایبێت ، بەڵام ئەوەی بە هەڵە بەکاری دەهێنێ ، ئەوە خۆی لێی بەرپرسیارە .

وەلەم قسانەش کە کردمان ، هەرگیز مەبەستمان ئەوەنی یە ، کە ئێمە کارو چالاکی و ، فرمێسک و خەفەتمان بۆ موسوڵمانانی میللەتانی تر نەبێت ، بەڵام کاتێ کە لەتەک خۆماندا ڕاست نەکەین ، هەردەعوایەکی تریش بکەین کاریگەر نابێت ، وە هەرگیز لەتەک ئەوەدا نین ، کە سیاسەت لە موسوڵمانی کورد حەرام بکرێت ، بەمەرجێ سیاسەت مەداری ئیسلامی کورد موسوڵمانان دوو لەت نەکەن ، دژ بە مەبادئی ئیسلامی نەوەستن دژ بە ڕێبازی ئەهلی سوننەت و جەماعەت نەبن ، لە لایەکی تریشەوە دۆست و هاوڕازی بزاڤی گەلەکەیان بن ، نەبنە ڕێگر بۆ سەربەستی و ڕزگاری نەتەوەکەیان ، بە ڵکو هاوڕازو هاوکارین لە تەکیاندا .

بەڵام دووبارە دەڵێم ، خزمەتی وولات ، بە هەردوو شاباڵی ئیسلامەتی و نیشتیمان پەروەری ئەکرێت ، نا بێ لەیەک جودا بکرێتەوە .

١٩ .... ئیسلامی سیاسی ئەمڕۆ ، بە چاکسازو سەلەفیەتەوە ، نەیەتوانیوە زۆر پابەندی بکات ، لە مەبدەئی نەگۆڕ و جێگیر و ، گرنگەکانی ئیسلام .

لەگەڵ شنەبای هەوای شەن کردندا ، ئەوانیش هەندێ گۆڕان بەسەر بیرو بەرنامەیان دێت و ، تەنها بۆ ڕازی کردنی خەصمەکانیان ، ڕەنگە هەندێ شت بکەنە بەرنامەی خۆیان ، کە لەئیسلام دا هیچ شەرعیەتێکی پێ نەدرێت ، یان هەندێ جار ، کە بزانن بەرژەوەندی

سیاسی لەکوێدایەو ، لە چ ئاستێکدایە ، یەکسەر هەڵگۆڕانێکی کتو پڕی دەهێنن بەسەر هەڵوێستەکەی دوێنێ یاندا ، ئیسلام دەبەن بۆ ئەو حاڵەتەی ، کە لەتەک ئەم چەرخەدا بگونجێ ... واتە .. کاریَ ناکەن ، ئەرێت و ئارەزواتی خەڵکی ، بەرەوپابەندی بە ئیسلامەوە بهێنن ، بەداخەوە لە زۆر کاتدا ئیسلام نزیک دەکەنەوە لە ویست و هەواو ئارەزواتی خۆیان ... کە پێغەمبەریش ﷺ فەرمویەتی (لايؤمن أحدكم حتىٰ يكونَ هَوَاهُ تبَعاً لما جئت به) کەواتە : ئەوەی بەپێچەوانەی مەبەست و ناوەڕۆکی ئەم فەرمودەوە کاربکات ، ئەوە بە ئیسلام ، خزمەتی خۆی دەکات و ، هەرگیز مەبەستی ئەوە نی یە کە خزمەت بە ئیسلام بکات ..

٢٠ .... بۆیە لە کۆتاییدا داوامان لە خودای پەروەردگار ئەوەیە ، کە بمانکات بە خزمەتگوزاری ڕاستەقینە بۆ ڕێبازی ئیسلام و ، دڵسۆزی وڵات و نیشتمانەکەمان. وامان لێ نەیەت ، کەسبەینێ موسوڵمانە ڕاستەکان ئێخەمان لێ هەڵبتەکێنن ، خەڵکێکی تریش پێمان ڕازی نەبوبێت ..

وامان لێ نەیەت ، بەهۆی ئێمەوە ڕەخنە و تۆمەت ڕو بەڕوی ئیسلام و موسوڵمانان بکرێتەوە ، وامان لێ نەیەت ، بە هۆی ئێمەوە خەڵکی لە کوردو کوردایەتی بێزاربێت و هەزاران ڕەحمەت بنێرن بۆ کفن دزی پێشوو ..!!!

خودایە لە ئیسلام حاڵیمان بکەیت و ، ڕێنمایی گەنج و ڕوناکبیرانی کوردیش بکەیت کە لە موسوڵمانە ڕاستەکان بگەن و ، ڕاست و بەتاڵ لەیەک جودا بکەنەوە و ، هەندێ لەبنەماکانی پەیڕەوی سەلەفیەتیش ، بەهۆی دووتوێی ئەم پەڕاوەی نووسەر حاڵی بن و ، بەچاوی ئینساف و وورد بینی و ، توێژینەوەو لێکدانەوەی تەواوە وە بنوارنە هەموو ووتەکان و ، سەرنجی خۆیان بدەن و ، بڕیار بدەن کە هاوڕازی ڕاستی بن و ، چۆن لەسەر خێرو ڕاستی متمانە پەیدا ئەکەن ، ئاواش پابەندی لێ بکەن و ، لە لۆمەی لۆمەکارانیش نەترسن ..

بسم الله الرحمن الرحيم

قل هذه سَبيلي ، أدعوا الىٰ الله عَلىٰ بَصيرَة ، أنا وَمَن اتبَعَني وَسُبحان الله ، وَمَاانا مِنَ المُشركين ... صدق الله العظيم

وصلى الله وسلم على سيدنا وملاذنا وسندنا محمد وآله وصحبه ومن تبعه ودعى بدعوته الى يوم الدين .. والسلام عليكم ورحمة الله وبركاته

# پێشینەویستی (السلفیە)

## پێشەکی:

ئەگەر مەبەستمان لەوشەی (السلف) مانا زمانەوانیەکەی بێت، ئەوە شتێکی (نسبی)یە، واتە: هەموو کاتێک دەگرێتەوە، بەپێ ی خولانەوەی چەرخ و دەوەرانی مێژوو، وەک (پێش دوایی)، چونکە هەر کاتێک تۆ بیگریت بەنیسبەت کاتی دوای خۆی (سلف)ەو، بەنیسبەت کاتی پێش خۆی (خلف)ە.

بەلاّم ئێستا ئەم ووشەیە مانایەکی تایبەتی وەرگرتوە ،کە ئەویش بریتی یە لە: ئەوسێ سەدەیەی یەکەمی ئیسلام، لەتەمەنی ئوممەتی ئیسلام، ئومەتی حەزرەتی محمد}( ﷺ ) سەرچاوەکەشی ئەم حەدیسەیە کە دەفەرموێت :ـ ( خير الناس القرن الذي أنا فيه ،ثم الثاني ثم الثالث ) رواه مسلم .. عن (عائشه ) ( ١ ) . (باشترین کەس ئەوانەن کە لەم سەدەیەی من دادەژین، ئینجا ئەوانەی دوای ئەوان دێن، ئینجائەوانەی دوای ئەوان)

بۆمان هەیە بپرسین: ئایامەبەستی پێغەمبەر( ﷺ ) لەو سێ سەدەیە، هەموو ئەوانەن کە لەو کاتەدا ژیاون، واتە هەموو تاک تاکێک ، یان کۆمەڵەکە بەگشتی؟

زۆربەی زاناکان لەو بروایەدان کە مەبەست هەموویانە. بەلاّم (ابن عبدالبر) دەفەرموێت: مەبەست کۆمەڵەکەیە بەگشتی، ئەگینا تاکی وا هەبووە کە لەوەی پاش خۆی باشتر نەبووە.

هۆی باشی ئەمانەش دەگەرێتەوە بۆ ئەوەی، کە ئەمانە لەسەرچاوەی بێ خەوشی پێغەمبەرایەتیەوە نزیک بوون،جارێ سەدەی یەکەم، راستەوخۆ لەگەڵ پێغەمبەردا ژیاون و، سەدەی دووەمیش روناکایی پێغەمبەرایەتیان لەهاورێکانیەوەپێگەیشتووە، وە سەدەی سێ هەمیش کۆتایی ئەو نورە بووەو سەرەتای داهێنانی شتی (ئەوباو)وداهێنراوبووە ، ئیتر دوای ئەمان هەر دەستەو کۆمەڵێک رێچکەیەکی تایبەتی بۆ خۆی هەڵبژاردوەو، بەپێچەوانەی ئایەتی (وَ أَنَّ هذا صِراطي مُسْتَقيماً فَـاتَّبِعُوهُ وَلاتَتَّبِعُـوا السُبُلَ فَتَفَـرَّقَ بِكُمْ عَـنْ سَبيلِهِ ذَلِكُمْ وَصَّاكُمْ بِهِ لَعَلَّكُمْ تَتَقُونْ ) الأنعام/١٥٣ جولاّنەتەوە، بەرە بەرە دووبەرەکی و کۆمەڵ کۆمەڵیەتی فراوان بووە، وەک پێغەمبەر دەفەرموێت ( لايأتي زمان عليكم، الا الذي بعده

---

( ١ ) فيض القدير ج١ ص٤٨٧

شرّ منه) ، ئەمە حەقیقەتێکەو هیچ گومانی تیا نی یە، جا بزانین ئەم راستی یە بەرەو کوێمان کێش دەکات؟ ئەمە بەرەو ئەوەمان کێش دەکات، کە ئەقلّ و هەڵس و کەوتمان بەخۆشەویستی ئەو پێشینانە ببەستینەوە، وە پابەندی تێگەیشتنی دەقەکانی ئەوان بین، چ لەبارەی بنەما عەقایدی یەکان، چ لەبارەی هەڵس و کەوتی رۆژانەمان، وە هەرچی بەپێچەوانەی ئەوەوە بوو وازی لیّ بهێنین و لیّی دوربکەوینەوە، ئەوەش ئامۆژگاری پێغەمبەری خۆشەویستمانە وەک دەفەرموێت:- جولەکەکان بون بە(٧٢) بەشەوە، نەتەوەی منیش دەبێت بە(٧٣) بەش و کۆمەڵ، بەلاّم هەموویان دەچنە ئاگرەوە، تەنها یەکێکیان نەبێت. عەرزیان کرد: ئەوە کامەیە؟ فەرموی: ئەوەی من و هاوڕێکانی منی لەسەرن..].

ئەوەشمان کاتێک بۆ دێتەدی، کە بەتەواوی پابەندی بەرنامەو رێچکەی ئەو پێشینانە بین، لەتێگەیشتنیان لەقورئان و حەدیس، چونکە ئێمە هەر لەبەر ئەوە پابەندیان نین چونکە پێشینەن، نەخێر، بەڵکو لەبەر ئەوەیە : چونکە لەهەموو کەس باشتر لەقورئان و حەدیس گەیشتوون، وە زمانەکەیان باش زانیوەو، نزیکترین کەس بوون لەپێغەمبەرەوە ( ﷺ ) بێجگە لەوەش کە پاکترین وراستترین ئایین یان هەبووە وە جێگەی متمانەی هەموان بوون. تێگەیشتنی قورئان و حەدیس کاتێک ڕاست دەردەچێت، کەلەسەر بەرنامەیەکی دیاری کراو دارێژراو بێت، ئەویش تەنها بۆ ئەوان رەخساوەو هەر ئەوان توانای دەرهێنانی بنەماو لێکدانەوەی دەقەکانیان هەبووە. شوێن کەوتنی ئەو پێشینانەش بەوە نابێت کە دەقاو دەق خۆمان بەووتەو هەڵوێستەکانیان ببەستینەوە، بەڵکو بەوە دەبێت کە ئەو بنەماو بنچینەو رێگایانە شارەزا بین، کە ئەوان پەیڕەوییان کردون، کە ئەویش ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە لەهەموو چەرخێکدا.

کەواتە گەڕانەوە بۆ ئەو بنەمایانە، تایبەت نییە بەچینێکی پێشوو، بەڵکو دەبێت هەمیشە ئەو بنەمایانە بکەینە سەرچاوەو، وەک چرایەکی روناک رێگای ژیانمانی پیّ رووناک بکەینەوە.

ئەمەی باسمان کرد شتێکی ناشکرایەو، هەموو کەس دەیزانێت، کەواتە ئەگەر ووشەی پێشینان(السلف) بکەینە زاراوەیەکی تازەو، بیکەینە بار بەسەر شەریعەتی ئیسلامەوە، کارێکی ئێجگار هەڵەمان کردوە، چونکە ئەگەر کارێکی وامان کرد، ئەوا بەدەستی خۆمان دان بەبوونی کۆمەڵەیەکی تری موسوڵماناندا ئەنێین، کە لەم رۆژانەدا بەرەو پەرەسەندن و زۆر بوون دەچن.

بەڵکو ئەگەر بووترێت: داهێنانی ئەم زاراوە، بەومانایەی ئێستای (بدعە)یە لەئایین دا، کە هەرگیز نەپێشینەکان و نەئەوانەی دوای ئەوانیش نەیان وتووە، ئەگەر شتی وا بووترێت

ڕەنگە قسەیەکی ڕاستمان کردبێت، چونکە ئەوان (خ) مانای ئەم ووشەیەیان نەکردووە بەدیمەنێکی تایبەتمەند بەخۆیان، کە لەخەڵکانی ترجیایان بکاتەوە، بەڵکو پەیوەندییەکی زۆر پتەو هەبووە لەناو ئەوان و، ئەوانەی دوای ئەوان هاتوون، وە هیچ شتێک لێکی جیا نەکردوونەتەوە. لەگەڵ ئەوەش دا، ئەگەر وای دابنێین: کە ئەوانە کۆمەڵێکی سەربەخۆ بوون، ئێمەش دەمانەوێت بچینە ناو ریزەکانیانەوە، پێویستە ئەو پرسیارە بکەین:ئایا یاساو پرۆگرامی ئەوان چی بووە، تا ئەگەر شوێنی کەوتین ببینە ئەندامێک لەو کۆمەڵەو، بەبۆیەورەنگی ئەوان خۆمان ڕەنگدار بکەین ؟.

لەوەڵام دا تەنها دوو وەڵام هەیەو هیچی ترنیە :

یەکەم: ئەوەیە کە بوترێت: پێویستە ئەو کەسە دەقاو دەق خۆی بەە ستێتەوە بەووتەو کرداریان نەلێی زیاد بکات و نەلێشی کەم بکاتەوە. ئەو کاتە ئێمە دەڵێین: بەڵام خۆ ئەوان خۆیان شتی وایان نەووتوە، هەرگیز بەو دیدەوە سەیری خۆیان نەکردووە، بەڵکو ئەگەر شتێک دەقێکی ئاشکرای لەسەر نەبووبێ، ئەوا بەپێی بارو دۆخ و پێویستی یەکان هەڵوێستیان گۆریوەو، زۆر جاریش لەسەر مەسەلەیەک دیدو بۆچوونی جیاوازیان هەبووە ،بێ ئەوەی کەسیان ئەوەی تر بەگومرا بزانێت.

پێغەمبەر (ﷺ)و هاورێکانی کاتێک لە(مەککە) بوون، بەچەند عورف و عادەتێک ڕاهاتوین، کەچی کە هاتنە (مەدینە) ڕووبەڕووی چەند عورفێکی نوێ بوونەوە، وەک شێوەی جل و بەرگ و خانوبەرەو... کە زۆر بەباشی وەریان نەگرتن و، هەڵس و کەوتیان لەگەڵ کردن بۆ نمونە : زۆربەیان لە(مەککە) پۆشاکی دوراویان لەبەر نەکردبوو، کەچی کە هاتنە (مەدینە)و لەگەڵ خەڵکی نوێ و خەڵکانی تر تێکەڵاو بوون، باشترین و جوانترین پۆشاکی دوراویان لەبەر کرد، وە هەروەها لەبارەی خانووبەرەشەوە لاسایی ئەمانیان کردەوە، قاپ و قاچاخی شوشەیان بەکار نەهێنا بوو بەکاریان هێنا.

بەدرێژایی ئەو ماوەیەی کە پێغەمبەر (ﷺ) لەمەککە بوو، مۆری بەکار نەهێنا بوو، کاتێک کە عەرزیان کرد پاشاکان نامەی مۆر نەکراو ناخوێننەوە، مۆرێکی لەزیوو هەڵکەند، کە لێی نووسرابوو :( محمد رسول الله ).

حەوت هەشت ساڵ لە مزگەوتەکەی پاڵی ئەدا بەدرەختێکەوە، ووتاری ئەخوێندەوە: کاتێک ژنێکی خەڵکی مەدینە هاتە خزمەتی وعەرزی کرد: کورەکەم دارتاشە، باشتێکت بۆ دروست بکات لەسەری دابنیشیت، فەرمووی: باشە. ئەوەبوو (منبر)یان بۆ دروست کرد. لەمەککە زۆر گرنگی یان بەخوێندنەوەو نوسین نەدەدا، کەچی کە هاتنە مەدینە، پێغەمبەر (ﷺ) هانی هاورێکانی دا، کە فێری خوێندنەوەو نوسین ببن ئەوەبوو خانوەکەی (مەحزەمەی کوری نەوفل ) یان کرد بەقوتابخانەو، چەند مامۆستایەکیان لە

لەژنان وکافرەکان بۆ تەرخان کردن ، کاتێک کە مزگەوتەکەی خۆی بنیات نا ، دیوارەکانی بەخشتی کاڵ و ، سەرەکەی بەلقی دار خورما دروست کردو ، ژێرەکەشی گڵ بوو ، لەسەردەمی خەلیفە (عثمان ی کوری عفان ) رەزای خوای لێ بێت. دا کرا بەبەردو گەچ، کۆڵانی شارەکان و شەقامەکان تەسک و خانوەکان نزم بوون، کاتێک عێراق رزگار، خەلیفە (عمر) ( خ ، ر ) فرمانی دا بەدروست کردني شاری کوفەو بۆ خۆی پانیی شەقامەکان و کۆڵانەکانی دیاری کرد بەشێوەیەک کە لەگەڵ بارودۆخە تازەکەدا بگونجێت.

بەدرێژایی سەردەمی صحابە ، هەموو کەس دەیتوانی لە(مینا ) خانووبەرە دروست بکات، کەچی لەسەردەمی حەزرەتی (عمری کوری عبدالعزیز) (ر.خ)دا کاتێ حاجی یەکان زۆر بوون، فەرمانی دا کە ئیتر کەس نابێت خانوو لەو ناوەدا دروست بکات.

لەسەردەمی (صحابە )دا کەس متمانەی بەشایەتی منداڵ نەبوو، لەهیچ جۆرە دەعوایەکدا، کەچی لەسەردەمی (تابعين)دا (عبدالرحمن بن ابی لیلی) کە یاسا ناسێکی بەناوبانگ بوو. بڕیاری دا، کە شایەتیان لەسەر مەسەلەکانی خۆیان وەربگیرێت ، وەک جل دڕان و بریندار بوون، لەکاتی یاری دا، چونکە پیاوی گەورە ناچێتە ئەو شوێنانە ئەی چۆن دووبەرەکی یەکانیان چارەسەر بکرێت؟

زانایانی (تابعين) زۆر شتی نوێیان داهێنا، کە لە کاتی (صحابە )دا هەر نەبووە ، (البحتری) دەڵێت: چوومە لای قازی (شُرَيْحْ)و لێم پرسی: دەربارەی قەزاو دادوەری چی تازەت داهێناوە؟ ووتی: منیش وەک خەڵکی ترم کرد، ئەوان دایان هێناو منیش وام کرد.

هاورێکانی پێغەمبەر (ﷺ) خۆیان بەدەقی ئایەتەکانەوە دەبەستەوە، بەتایبەتی لەبواری مەسەلە عەقائیدی یەکان دا، هەرگیز خۆیان بەمەسەلەی کێشەو ململانێی بێ هودەوە خەریک نەدەکرد، خۆ ئەگەر یەکێکیش بیویستبایە ئەو جۆرە کێشانە دروست بکات، ئەوا بەهەموویان دەمکوتیان دەکردو ماوەیان پێنەئەدا.

بەڵام لەسەردەمی (تابعين)دا کاتێک پانتایی ئیسلام فراوان بوو، بازاری عیلم و زانست گەرم بوو، وە (صحابە )کان بەرە بەرە کەم بوونەوەو، خەڵکێکی زۆر لەخاوەن ئاینەکانی تر موسوڵمان بوون وەک: (جوولەکە، گاور، مانەوی، زەردەشتی) کە ئەمانە زۆر مەسەلەی گوماناوی یان پێ بوو، چار نەما کە دەبوو بەریەرچی بیرورا گوماناوییەکان بدرێتەوە بەشێوەیەکی زانستیانە، ئەوەبوو (عبدالله بن عباس) دەکەوتە موناقەشەوە لەگەڵیان و، راکانیانی پووچەل دەکردەوە، هەروەها (ئیمامی عەلی) دەربارەی قەزاو قەدەرو جەبرو ئیختیار دەکەوتە قسەکردن لەگەڵیان و ، ڕای راستی بۆ روون دەکردنەوە ، زۆر لەزانایان

بەو کارەوە خەریک بوون ، بەمەبەستی پاراستنی موسوڵمانان لەو راپووچەڵ وناراستانە، وەک. (حسن البصری. عمر بن عبدالعزیز. عطا بن ابي رباح، سلیمان بن یسار. طاووس بن کیسان) و کەسانی تر، ئێمە خوا یار بێت چەند نموونەیەک لەم جۆرە موناقەشانە لەبەشێکی تری ئەم نامیلکەدا باس دەکەین...

ئەمانەی سەرەوە چەند نموونەیەک بوون لەو گۆرانکاری یە جیاجیایانەی ،کە لەسەردەمی پێشینان دا رووی داوەو، زۆربەشیان لەچەرخی یەکەم دابووە، کە بەپێی شایەتی پێغەمبەر (ﷺ) باشترین چەرخ بووە.

کەواتە دەرکەوت: کە وەڵامی یەکەم وەڵامێکی بێ ماناو ناراستە، چونکە ئاشکرامان کرد، کە پێشینەکان خۆشیان بڕوایان بەو جۆرە خۆ بەستنەوەیە نەبووە، بەڵکو زۆر جار وازیان لەعادەتێک هێناوە، چونکە باروزروفی بەسەر چووە، جا ئیتر چۆن لەکارێکدا (تقلید)یان بکەین، کە خۆیان بڕوایان پێ نەبووە؟

وەڵامی دووەم :

کە بوترێت ، رێگای چونە ناو بازنەی ئەم کۆمەڵەیە ئەوەیە، کە پەیرەوو رێرەوە راستیەکان بزانیت، کە چۆن تەفسیری دەقەکانیان کردووەو، ئەحکامیان چۆن دەرهێناوەو، بنەمای (اجتهاد)یان چۆن دارشتوە، تۆش بەهەمان رێگاو بەهەمان شێوە هەوڵی تێگەیشتنی قورئان و حەدیس بدەیت و، جیاوازی لەنێوان جۆرە نەگۆرو جۆرە گۆراوەکاندا بکەیت، ئێمەیش لێرەدا دەڵێین: -

بەڵام ئەم بەرنامەیە بەدرێژایی مێژوو، نیشانەی کۆمەڵەیەکی تایبەتی نەبووە، بەڵکو نیوەی چەرخی پێشینان رۆیشتوەو، کەس باسی زاراوە دانان و نوسینەوەو کتێب دانانی نەکردووە، بەڵکو هەر بەشارەزایی خۆیان پشتیان دەبەست، تەنانەت لەسەردەمی تابعین دا، زۆر جار ناکۆکی دەکەوتە نێوان سەرانی قوتابخانەی رادەربرین و قوتابخانەی حەدیسەوە، لەگەڵ ئەوەش دا کە هەردووقوتابخانەکە ، بەبناغەی چەرخی سەلەفی دادەنرێت، ئەوەبوو لەئەنجام دا، ئیمامی شافیعی و چەند کەسێکی تر توانیان بنەمایەکی پتەو دابنێن، بۆ شێوەی وەرگرتنی ئەحکام لەدەقەکان و، رێ و شوێنی (إجتهاد)یان دانا، ئیتر لەو کاتەوە ئەم بنەمایانە بوون بەسەر مەشق، بۆ هەموو ئەوانەی کە دوای ئەوان هاتن، تەنانەت ئێستاش هەر کەسێک لەسەر ئەو رێنمایانە بڕوات ، ئەوە بەراستی موسوڵمانە، زۆر جار وابووە، کە لەبەر ئاشکرا نەبوونی چەند مەسەلەیەک، ناکۆکی کەوتۆتە نێوان زاناکانەوەو، هەریەکەیان (اجتهاد)ی خۆی بەراست زانیوە ، بەڵام هەرگیز راکەی تریان بەگومرا نەزانیوە، چونکە ئەوەیان بەخۆپەرستی داناوە، کە رای خۆیان بەراست بزانن و خەڵکی

بەگومڕاو سەر لێ شێواو. کەواتە بەئاشکرا بۆت دەرکەوت، کە(سەلەفیەت ) بریتی یە لە قۆناغێک لەقۆناغەکانی کات، کە پێغەمبەر (ﷺ) لەقۆناغەکانی تر بەچاکتری داناوە. جا ئەگەر کۆمەڵە موسوڵمانێک خۆیان ببەستنەوە بەوانە کە لەو قۆناغەدا ژیاون و، ناوێکی تازە لەخۆیان بنێن، ئەوە بەڕاستی کارێکی (بدعە)یەو، دابەش کردنی موسوڵمانانە بەچەند پارچەو کۆمەڵێکەوە کە لەڕاستی یەوە دوورە...



## ئەو هۆکارانەی کە بوون بەهۆی پەیدا بوونی بەرنامەی زانستی یانەو باسێکی کورتی ئەو بەرنامەیە .

(ئەو دوو تایبەتمەندی یانەی کە تەنها بۆ هاورێکانی پێغەمبەر هەبوون) .

ئەو تایبەتمەندی یانەی کە هاورێکانی پێغەمبەربۆ خۆیانن وە لەچەرخەکانی دوایی دا نەماون و ، هەر بەهۆی ئەوانەشەوە پێویستیان بەگەرانەوە بۆ بەرنامەی زانستی یانە نەبووە بریتین لە:

١ . ئەو زمانە عەرەبی یە پاکەی کە هیچ شتێکی تری تێکەڵاو نەبوو بوو .

٢ . ئەو ئیسلامەتی یە خاوێنەی کەوای لیّ دەکردن شتەکان قبوڵ بکەن.

ئاشکرایە کاتێک پێویستیمان بەبەرنامەی زانستی یانە دەبێت بۆ وەرگرتنی ئەحکام، کە ئەو کەسە لەزانینی عەرەبی و ئەدەبەکەی دابیّ هێز بێت، یان لەئەنجامی کێشەو ململانێی، کە لەنێوان لایەنەکاندا روو دەدات، کە ئەو دوو هۆیەش لەسەردەمی (صحابە )دا نەبوون، بێجگە لەوەش مەسەلە دینیە کان زۆر کەم بوون و ، لەدەقەکانی قورئان و حەدیس بەدەر نەبوون و ، خۆشیان لەزمانی عەرەبی دا شارەزا بوون و ، بەهۆی ئەو ئیمانە پاک و بیّ خەوشەی هەیان بووە ، مەسەلەکانیان وەک خۆی وەرگرتووە ، هەرگیز بەکار هێنانی رایان لەئاینی دا بەباش نەزانیوە ، تەنانەت زۆر جار بەخراپە باسیان کردووە ، وە لەسەرەتای چەرخی یەکەم دا ، هیچ کەس لەئاین دا راو بۆچوونی خۆی بەکار نەهێناوە ، وە ئەگەر شتێک (شارع) باسی نەکردبێت هەرگیز پرسیاریان لەدەربارەیەوە نەدەکرد ، چونکە دەیان ووت ئەوە پەلە کردنە لەشتێک کە کاتی نەهاتووە ، یان خوای مەزن بۆیە باسی نەکردووە چونکە دەیەوێت باری شانیان قورس نەکات..

حەزرەتی ( سعد بن أبی وقاص ) دەفەرموێت : (گەورەترین تاوانبار ئەو کەسەیە ، کە بەهۆی پرسیار کردنی ئەوەوە شتێکی حەلاڵ حەرام بکرێت. ) یان (أبي ثعلب) کە دەفەرموێت : خوای مەزن چەند شتێکی فەرز کردووە مەیان فەوتێنن و ، چەند سنورێکی داناوە مەیان بەزێنن و ، لەچەند شتێک بیّ دەنگ بووە لەبەر بەزەی هاتنەوە پێیان باسی مەکەن.

یەکێک لەو جۆرە باسانەی کە باشتر وایە پرسیاری لەدەربارەوە نەکرێت، مەسەلەی شتە غەیبی یەکانە، کە هەستیان پیّ ناکرێت وەک: گیان (الروح) ، چۆنیەتی زیندو بوونەوەی لەش، نیشانەکانی رۆژی دوایی و... هتد ، تەنانەت پێغەمبەر(ﷺ) زۆری پیّ ناخۆش بووە کەپرسیاری لەو بارانەوە لیّ بکرێت، وەک ئەوحەدیسەی کە (ابو هریرە) دەی گێرێتەوە

( لایزال الناس یتساءلون حتی یقال:-هذا اللهُ خلقَ الخلْقَ فَمَنْ خَلَقَ الله ؟ )دیاره ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت ، کە ئەوانەی پێ خۆش نەبووە.
بەڵام باسەکانی تر ئەوانەی کە خەڵک پێویستی پێیانە وەک: پرسیار دەربارەی مانای دەقێک، یان چۆن دەبێتە بەڵگە بۆ حوکمێک ، یان ئەو شتانەی کە هیچ دەقێک دەربارەیانەوە نییە ، ئەوە دەبێت پرسیاریان دەربارە بکرێت، بەڵکو ئەوە هەر زۆر پێویستەو (صحابە )هەمیشە پرسیاریان کردووە ، وەک (سەربڕینی حەیوان بەقامیش. گوێ ڕایەڵی فەرمانڕەوایان بۆ شتی نارەوا،نارەق خواردنەوە ، قومار ، شەر لەمانگە حەرامەکاندا. هەتیوان. حەیز. . ڕاوکردن.... ) بەڵکو زۆر جار ئەو کەسەی کە پرسیارەکەی کردووە هان دراوەو ، سوپاسی کراوە وەک حەدیسی (عائشە) کە سوپاسی ژنە ئەنصاریەکانی کردووە (من أجل ان الحیاء لم یمنعهن ان یسألن عن احکام دینهن.. ) .

زۆر جار هەیبەتی پێغەمبەرایەتی و ، ئەوهەموو شەرمەی کە صحابە دەربارەی پێغەمبەر هەیان بوو ، نەیان توانیوە درێژە بەپرسیارەکانیان بدەن ، هەر لەبەر ئەوەش بوو هاتنی وەفدی ئەعرابی یەکان یان بەفرسەت دەزانی و ، گوێیان ئەگرت داخۆ پێغەمبەر چۆن وەڵامی پرسیارەکانیان دەداتەوە ، چونکە ئەوان ئەو شەرمەیان نەبوو ، (ئەنەس) دەفەرموێت: (کانَ یُعْجِبُنا انْ یَجیئَ الرَّجُلُ العَاقِل مِنْ أَهْلِ البَادِیَةِ فَیَسْأَلَه وَنَحْنُ نَسْتَمِعُ).

(أبی أمامە) دەفەرموێت : کاتێک ئەم ئایەتە هاتە خوارەوە کە دەفەرموێت: (یاأَیُّهَا الَّذِینَ آمَنُوا لاَتَسْأَلُوا عَنْ اشْیاءَ إِنْ تُبْـدَ لَکُمْ تَسُؤْکُمْ ) المائدة(١٠١). ئێمە ئیتر شەرممان ئەکرد کە پرسیاری لێ بکەین ، لەبەر ئەوە چوینە لای ئەعرابی یەک وپۆشاکمان دایە تاپرسیار بکات ، (البراء) دەفەرموێت : (ان کان لَتَأ تي علَیَّ السَنَةَ أُریدُ أَنْ اسأَلَ رَسُولَ اللّه ﷺ عَنْ الشَئ فأتَهَیَّبَ . وان کُنا لنتمنی الأعراب -اي قدومهم- لیسألوا فنسمع اجوبة سؤالات الأعراب فنستفیدها).

لەمەوە بۆمان دەردەکەوێت، کە ئەو تایبەتمەندیانەی (صحابە ) ، وای لێ کردبوون، کە پێویستیان بەبەرنامەی زانستی یانە نەبێت، بەڵام ئەمە تەنها بۆ ئەوان بوو ، ئەوانەی دوای ئەوان ، بەهۆی گۆڕانی بارودۆخ و هۆکارەکان و ، نەمانی ئەو تایبەتمەندی یانە ، ناچار بوون کە هەوڵی گەڕان بەدوای بەرنامەیەکی زانستی یانە بدەن ، ئێستاش بابزانین ئەو گۆڕانە چۆن پەیدا بوو ؟ وە ئەو هۆکارانە چی بوون ؟ لەمەودوا بەیاریدەی خوا لێیان دەدوێین .

## ئەو بارودۆخ و هۆکارانەی کەبوون بەهۆی گۆڕانکاریەکان

لەمەوبەر ئەوەمان باس کرد، کە ژیانی صحابە و ئەو چەرخەی تیا ژیان بارێکی تایبەتی بوو. بەلاّم ئەمە بەردەوام نەبوو، بۆیەشە زۆر لەشێوازە فیکری یەکانیان گۆڕی و، نەریتی تازەیان داهێنا، وا بەکورتی باسی ئەو هۆکارانە دەکەین، کە بوون بەهۆی پەیدا بوونی بارودۆخە تازەکە:

١. فراوان بوون و پەرەسەندنی فتوحاتی ئیسلامی: ئەمە بوو بەهۆی گەشە کردنی شارستانیەتێکی تەواو، کە زانست بنەمایەکی سەرەکی بوو تیایدا، کە لەسەرناستی رۆشنبیری، چەند عادەتێکی نوێ هاتنە کایەوە، شێوەیەکی تازە لەئاوەدانی و بنەماکانی ژیانی کۆمەلاّیەتی و ئابووری پەیدا بوو. وەلەسەر ئاستی زانستی ئەلّقەکانی فێرکردن و گیرەو کێشەی زۆر لەبواری ئاینی و ئەدەب دروست بوون، چار نەما، دەبوو بچنە ناو گێژاوی نهێنی یەکان و، بەووردی مەسەلەکان ئالّوگۆڕ بکەن و، لەرێگای (اجتهاد)ەوە بگەنە راستی یەکان، دیارە لەم باسە زۆرانەدا، بیرو باوەری جیا جیا هاتنە کایەوە، کە دەبوو هەموویان تۆمار بکرێن.

٢. بەشێکی زۆر لەوانەی کە لەئاینەکانی ترەوە هاتنە ناو ئیسلامەوە، وەک : جولەکەو مەسیحی و زەردەشتی و هی تر، کە زۆربەیان زانای ئایینەکانی خۆیان بوون، پاش ئیسلام بونیان ، کەوتنە بەراورد کردن لەنێوان ئایینە کۆنەکەیان و ئایینی ئیسلام، کە ئەمەش بو بەهۆی پەیدا بوونی کێشەو ووتووێژ..رەنگە زۆر دوور نەرۆین ئەگەر بلّێین: لەوانەیە لەناو ئەمانەدا هی وابووە هەندێک مەسەلەی ئایینە کۆنەکەی لاپەسەند تر بووە، بۆیە کەوتۆتە موناقەشەوە لەسەریان، ئەمەش وای لەزانا موسولّمانەکان کردووە، کە بکەونە ململانێ لەگەلّیانداو بەلّگەکانیان پوچەلّ بکەنەوە.

زۆربەی صحابە کان ناچار بوون ئەم رێگایە بگرن، تا بتوانن خەلّکی لەدەوریان دوور بخەنەوەو باوەریان بپارێزن. دیارە بۆ ئەم ململانێ یەش، دەبێت رێگای راست و بنەماکانی زمان و هێنانەوەی بەلّگەی عەقلّی بگرنە بەر...

٣. موسولّمان بوونی خەلّکێکی زۆر لەوولاّتە دراوسێکان و دوورەکان، کە پۆل پۆل روویان دەکردە ئیسلام، کە دەبوو بۆ فێر کردن، یان ژمارەیەکی زۆر لە(صحابە ) بەناویاندا بلاّو ببنەوە، ئەمانەش کاتێک خۆیان گەیاندە ئەو شوێنانە، بینیان کە بەرەو رووی چەند نەریتێکی نوێ و گرفت و کێشەی تازە دەبنەوە، ناچار بوون بۆ چارەسەر کردنی ئەمانە (را) بەکار بهێنن کە لەوە پێشتر ئەوەیان نەدەکرد، بەناوبانگترینیان ئەمانە بوون: (خولەفای راشدین.. عبداللەی کوڕی عمر.. عائشە) لەشاری مەدینە، ( عبداللەی کوڕی عەباس )

لەمەککە، (عبداللەی کوڕی مسعود) لەکوفە.. (انس کوڕی مالک وابو موسى الاشعری) لەبەسرە.. (عبادە ی صامت و معاذ بن جبل) لەشام.. (عبدالله ی کوڕی عمرو بن العاص) لەمیسر..] ڕەحمەتی خوایان لی بێ..

٤- بلاو بوونەوەی لادینەکان (الزنادقە) کە هەمیشە هەوڵی چەواشە کردنی موسوڵمانانیان دەدا، بەهۆی ئەو هەموو گومان و شوبهەو موناقەشانەی کە دەیان کرد، بۆ سەر لی شێوانی خەڵکەکە، ئەمانە لەپێشەوە کەم بوون، بەڵام بەرە بەرە ژمارەیان لەزیاد بووندابوو کە ئەمەش وای لەخاوەن غیرەتەکان کرد کە بکەونە خۆیان بۆ بەرپەرچ دانەوەیان و ، کاتێک سەیریان کرد کە ئەمانە بۆ سەڵماندنی ڕاکانیان بەڵگەی عەقڵی و ڕێگای مەنتیقی بەکار دێنن، ئەمانیش بەناچاری هەمان ڕێگایان گرتە بەرو، بەهەمان چەکی ئەوان کەوتنە بەربەرەکانی کردنیان، وەکو ئیمامی (علی) ئەفەرموێت:

(کلموا الناس بما یعرفون. ودعوا ماینکرون اتریدون ان یکذب الله ورسوله)؟.

موناقەشەکە مەسەلە عەقائیدیەکانیشی گرتەوە، کە لەوەو پێش کەس بەلایاندا نەدەچوو، پاش ئەوەی کە جاران بێ چەندو چوون پێیان ڕازی بوون، (کل من عند ربنا..) ال عمران/٧.

ئەم جارە کەوتنە هێنانەوەی بەڵگەی زانستی ومەنتیقی بۆیان ، هەر کەسێک شارەزای مێژووی (صحابە و تابعین) بێ، زۆر باش دەزانیت، کە ئەم چوار هۆکارەی سەرەوە لەیەک کاتدا پەیدا بوون، وە ئەو پێشینە بەرزانەیان ناچار کرد، کە شێوەی هەڵس و کەوتیان بگۆڕن و، شێوازی بیر کردنەوەو بەرهەڵستی بیروڕا نوێکان لەسەر بنەمای تازە دابڕێژنەوە..

ئێمە لیرەدا بەکورتی و خێرا، چەند بارێکی نوێ، کە بەهۆی ئەو هۆکارانە هاتبونە کایەوە، باسی دەکەین، کە تاکۆتایی سەدەی سێیەم بەردەوام بوو...

دەربارەی ئاوەدان کردنەوەو عادەتە کۆمەڵایەتی یەکان و، جم و جۆڵە ئابووری یەکان، چەند شێوەیەکی نوێ پەیدا بوون کە لەوەو پێش نەبوون، وەک:کە جاران خانویان بەقامیش و لقە دار خورماو خشتی کاڵ دروست دەکرد، کەوتنە بەکار هینانی خشت و بەردو گەچ و، فەرمانڕەواکانیان قەسری گەورەیان بۆ خۆیان بنیات نا، وە ئەندازیارەکان کەوتنە ڕەنگرێژی شارە نوێکان، وەک بەسرەو کوفەو شەقامی سەرەکی (٤٠) مەتری و شەقامی فەرعی (٣٠)مەتری یان کرد، وە لەسەر ڕێنمایی ئیمامی (عمر) یاسای بەرزی بیناکانیان دانا.

کارو پیشەی بازرگانی لەناو (صحابە)دا پەرەی سەند، کە جاران پیشەیەکی سووک بوو ،تەنها عەجەمەکان و (انباط) دەیان کردە پیشە. وە (ابن الحاج) لە (المدخل) دا بۆمان

دەگێڕێتەوە: جارێکیان ئیمامی عمر، بەناو بازاردا گەڕا، بێجگە لە(انبـاط) کەسی تری بەدی نەکرد کە خەریکی بازرگانی بێت، لەکۆبونەوەیەکدا گلەیی لێ کردن کە بۆچی بازرگانی ناکەن؟. ئەوانیش لەوەلامدا وتیان، خوا ئەوەندەی رژاندوە بەسەرمانا کە پێویستیمان بەبازار نەبێت. ئەویش فەرمووی: (وَاللهِ لَئِنْ فَعَلْتُمْ لَيَحْتَاجَنَّ رِجَالُكُمْ إِلى رِجَالِهِمْ وَنِسَاؤُكُمْ إِلى نِسَائِهِمْ) پیشەسازیش کە لەوەو پێش عەرەبەکان زۆر گوێیان پێ نەئەداو، بەزۆری رۆم و فارسەکان دەیانکرد پەرەی ستاندو، لەناوصحابە کاندا بلاو بوەو، لەژێر کاریگەری ئەو هۆکارانەی باسمان کردن، موسوڵمانەکان کەوتنە داهێنانی ئاشی با، کە بەو بایە ئیشی دەکرد، کە لەکەلێتی چەند سندوقێکدا، یا تەختە دار کۆدەبوەوە، ئەوەش لەسەردەمی خەلافەتی حەزرەتی (عثمان) سالی ۲۹ک.

هەروەها دەستیان دایە پیشەی زەرەنگەری کە لەوەو پیش ئیشی جولەکەکان بوو، وەستای باشیان تیا هەڵکەوت، کە بەناوبانگترینیان (ابو رافع الصائغ) بوو ،کە ناوی(نفیع) بوو، هەموو جارێک ئیمامی عمر بەگاڵتەوە پێی فەرموو، (لە هەموو کەس درۆزنتر زەرەنگەرەکانن هەر ئەڵێن ئیمرۆ.. سبەی).

هەروەها پیشەسازی تریش بلاو بۆوە وەک: دارتاشی، نەخش، زەخرەفە، وێنە کردنی شتی بێ گیان..

(سعید بن ابی الحسن) ئەگێڕێتەوە ئەفەرموێت : لای (ابن عباس) دانیشتبووم پیاوێک هاتە لایی و پێی ووت: من ژیانم لەسەر وینەکردنە، ئەویش فەرموی: من ئەوەت پێ دەڵێم کە لەپێغەمبەرم بیستوە ئەیفەرموو: (من صور صورة فان الله معذبه حتی ینفخ فیها الروح ولیس بنافخ فیها ابدا) پیاوەکە زۆر خەمبار بوو، رەنگی زەردهەڵگەڕا، ئنجا پێی ووت: ئەگەر هەر ئەتەوێت وێنە بکەیت ، فەرموو ئەوە درەختە یان هەر شتێک کە گیانی لەبەر نەبێت).

پیشەسازی خواردەمەنیش پێش کەوت و، شێوەی ئامادەکردنی گۆڕا، بۆ یەکەم جار ئاردی سفریان بەکار هێنا، کە جاران لەشامەوە دەهات، کەوتنە دروست کردنی خواردەمەنی لێی، وەک پاقلاوەو حەڵواو شتی تر... ئاشکراشە لەوەو پێش بێژانەوەی ئارد باو نەبوو، بەڵکو بەکاریکی (بیدعە)یان دەزانی . لە(سهل بن سعید)یان پرسی: (أأکل رسول الله النقي؟ (یعني (الحوار)؟ قال: مارأی رسول الله النقي حتی لقی الله عزوجل). دەربارەی زانستەکان پەیدا بوونی کتێب و فراوان بوونی بازنەی (اجتهاد) ئەم نمونانە باس دەکەین: لەسەرەتای

ئیسلام بێجگە لەقورئان هیچ شتێکی تری نوسراو نەبوو، وە هەرگیز ئامادە نەبوون شتێکی تر وەک قورئان بنوسنەوەو حەدیسیش بە پچڕ پچڕی دوای هاتنی قورئان دەنوسرایەوە ، نەک هەمووی بەیەکەوە، بەڵام ئەم دیاردەیە دەوامی نەکرد، ووردە ووردە نوسراوی رێک و پێک هاتنەکایەوە، یەکەم کتێبی نوسراو لەسەردەمی(صحابە)دا (دیوان العطاء) بوو، کە بەرینومایی ئیمامی عمر نوسرایەوە لەلایەن (عقیل ابن ابي طالب ومخزمة بن نوفل وجبر بن مطعم).

پاشان موسوڵمانان کەوتنە سەر ئەوەی کە ئەو زانستی یانەی لەیەکترەوە فێری دەبن بیکەن بەکتێب و هەڵی بگرن، پاش ووتووێژێکی زۆر ئەوەیان بڕیاردا.

(ابن سعید) لە(الزهری)یەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ : (پێشان زۆر ڕقمان لەنوسینەوەی زانستیی یەکان بوو پاشان بەزۆری ئەمیرەکان، ناچار کراین کە ئەو کارە بکەین و ئیتر کەس مەنع نەکەین..)

کاتێک صحابەکان بەناو وولاتانی ئیسلام دا بلاو بونەوەو، بەرەو رووی لێشاوی پرسیاروراپرسی بونەوە، بەهۆی جیاوازی شێوەی عاداتی جیا جیا، بەڵێ لەم کاتەدا بوو کە ناچار بوون بەپێی بارودۆخ و شوێن (فتوا)کانیان جیاوازو هەمە جۆر بێت، بەپێی دوورو نزیکی ئەو شوێنە لەنیوە دورگەی عەرەبەوە، بۆ نمونە ئەو (صحابە وتابعین)انەی کە لەشام بوون، بەزۆری خۆیان دەبەستەوە بەدەقەکانی قورئان و حەدیس و، تابۆیان بکرایە (اجتهاد)یان نەدەکرد، چونکە ناوچەکە لەمەڵبەندی ئیسلامەوە ئەوەندە دوور نەبوو، وە عادات و شێوەی ژیان جیاوازیەکی ئەوتۆی نەبوو، سەرەڕای ئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر زانای حەدیس و سوننەت لەو ناوچانەدا دەژیان.

بەپێچەوانەی ئەوانەی کە لەمیسرو عیراقدا دەژیان، کە زۆربەیان لە(فتوا)دا پشتیان بەبەکارهینانی ڕاو(اجتهاد)وە دەبەست، ئەوەش بەهۆی زۆری عاداتە نوێکان و، دیمەنی شارستانی تازەو، ئاشنا نەبوونیان پێیانەوەو، ژمارەی زاناکانیش کەمتر بوو.

هەر لەبەر ئەوەش بوو دیاردەی (الاجتهاد بالرأی) لەناویاندا بلاو بۆوە، وە دوو جۆر شێوەی (فتوا) هاتنە کایەوە، یەکێکیان تەواو پابەند بوو بەدەقەکانی قورئان و حەدیس و، ئەوی تریشیان بە ئاشکرا دیاردەی (اجتهادی) پێوە ئاشکرا بوو، کە ئەمەش بوویەهۆی پەیدا بوونی (مناقشە)و ناکۆکی لەنێوانیاندا، کە چار نەبوو دەبوو وابوایە ...

ئەمە دەربارەی مەسەلە (فقهی)یەکان، بەڵام لەمەسەلە عەقائیدی یەکاندا، وەکو لەهۆکاری چوارەم دا ئاماژەمان بۆ کرد ، کۆمەڵێ لەزانایانی ئایینەکانی تر هاتنە ناو

ئیسلامەوە، کە بەشێکیان لەجۆری (زندیق) بوون و، کەوتنە بڵاو کردنەوەی گومان و شوبهە لەمەسەلە عەقائیدی یەکان، بۆیە زاناو دڵسۆزەکانی ئیسلام کەوتنە بەرپەرچ دانەوەیان و، لەگەڵیاندا کەوتنە ململانێی فیکری و زانستی بەشێوازی خۆیان (أدع إلى سبيل ربك بالحكمة والموعظة الحسنة وجادلهم بالتي هي أحسن) النحل/١٢٥. دیارە چوونە ناو دەربارەی ئەم جۆرە باسانەش بەوە دەبێت، کە موناقەشەکان هەموو ئەو شتانە بگرنەوە کە گومانیان لەسەر هەبێت، وە پێویستە بەتەواوی بچنە بنج و بناوانی مەسەلەکان، ئەو مەسەلانەی کە جاران بەهیچ جۆریک خۆیان پێوە خەریک نەدەکرد، بەڵکو شتەکانیان وەک خۆی وەردەگرت و ، پێی ڕازی دەبوون، لەوانە بۆ نمونە: (الآيات المتشابهة). مەسەلەی قەزاو قەدەر کردەوەی مرۆڤ.. شێوەی زیندوو کردنەوە... هتد، وا لەخوارەوە چەند نمونەیەک لەو جۆرە موناقەشانەتان دەخەینە روو:

(ئیمامی عەلی) دەربارەی قەزاوقەدەر لەگەل کابرایەکی (قەدەری)دا دەکەوێتە گفتوگۆو، زۆر بەدرێژی لەگەڵیا دەدویت، پیاوێکی پیر دوای گەڕانەوەی لەجەنگی (صفين) ریی پێ دەگرێ و، دەربارەی (جبرو اختيار) پرسیاری لی دەکات، ئەویش زۆر بەدرێژی و بەهێمنی لەگەڵیا دەکەوێتە قسەو، وەلامی ئەداتەوە، هەروا ئیمامی عەلی زۆر جار لەگەل (خوارج)ەکان دەکەوتە قسە، دەربارەی کێشەو مەسەلە ئیعتقادی یەکان، یان (عبدالله بن عباس)ی دەنارد تا لەگەڵیان بدوێ.

(عبدالله بن عباس) کەوتە (مناظرة) لەگەل (يزيد بن عميره) دەربارەی ئیمان و، ئەو کێشانەی کە لەو بارەوە دروست کرابوو. (شێخ حەسەنی بەصری ) کە یەکێکە لەپیاوە گەورەکانی (تابعين) زۆر جار لەسەر مەسەلەی عەقائیدی، دەکەوتە موناقەشە لەگەل لادەرو خاوەن گومانەکان، یان نامەی دەنارد بۆ ئەم و ئەوو، ئەو شتە عەقائیدیانەی تیادا باس دەکردن، لەنامەیەک دا بۆ (عبدالملك بن مروان) دەربارەی قەزاوقەدەر دەنوسێت: (جاران کەس لەم جۆرە بابەتانە نەئەدوا، چونکە هەموو یەک بڕوا بوون. بەلام ئێستا ناچارین لێیانەوە بدوێین، چونکە خەڵکی کەوتونەتە گومانەوە دەربارەی زۆر لەمەسەلەکان، خوای گەورەش کۆمەڵەیەکی رەخساندووە بۆ بەرپەرچ دانەوەیان). لێرەدا پێویستە رەچاوی ئەوە بکەین کە وەک چۆن بڵاو بوونەوەی هۆکارەکانی (اجتهاد) لەمەسەلە ( فیقهی )یەکاندا، بوو بەهۆی پەیدا بوونی دوو کۆمەڵ، کە یەکێکیان تەواو بەمە رازی بوو وپەسەندی دەکرد، ئەوی تریان بەپێچەوانەوە دژی بوو، هەرواش لە مەسەلە عەقائیدیەکاندا هەمان دوو کۆمەڵ دروست بوون ، کە یەکەمیان بە کارێکی

رەواو پیێویستی دادەناو ، هەر بۆیەش زانستی (الکلام) داهێنرا نەوی تریشیان تەواو دژی بوو.
ئەم ناکۆکی وململانێ یە تادەهات پەرەی ئەسەندو ، بازنەکەی فراوانتر دەبوو ، وە پیێویستی بە چارەسەر کردنێکی بنەڕەتی هەبوو ، خوا یاربێ لەبەشی داهاتوودا لەو مەسەلەیە بەدرێژی ئەدوێین.



## ئەسڵی گیروگرفتەکەو ئەو بەرنامەیەی کە توانی یەکلای بکاتەوە

ئێستا بەتەواوی کاریگەری ئەو چوار هۆکارەت لەسەر گۆڕانەکان بۆ روون بویەوە، چ دەربارەی عادات و خووە کۆمەڵایەتی یەکان، چ ئەوەی کە پەیوەندی بە (اجتهاد)و رای شەرعەوە هەیە بۆ مەسەلە نوێکان، و خوودی مەسەلە عەقائیدی یەکان و بەئاشکرا بۆت دەرکەوت، کە لەئەنجامی ئەو گۆڕانکاریە زۆرانەدا، چ گرفتیکی گەورە هاتەکایەوە، کە هەرچەندە ئاسۆیەکانی زیاتر فراوانتر دەبوون،وە هیچ دەقێکیشیان لە قورئان و حەدیس بەدەستەوە نەبوو، تا گیروگرفتەکانی پێ چارەسەربکەن، ئەمەش وای کرد، کە جۆرە ئاژاوەییەک دروست ببێت و جۆرەها تیپ و گروپ پەیدابێن.

چەند عاداتیکی نوێ لە خواردن وخانووبەرەو کەل و پەل و پیشەسازی پەیدابوون، نەیان ئەزانی تاچ رادەیەک بەدوایان بکەون و، لەکوێ بوەستن و، بەچ تەرازویەک بیان کێشن .

بۆ نمونە: بۆ یەکەمین جار هێڵەک بۆ بێژانەوەی ئارد پەیدابوو، کە ئەمە بۆ ئەوان شتێکی تازە بوو، وە نیشانەی خۆش خواردن و تێروتەسەلی بوو، ئایا بەرامبەر بەمە دەبێ چی بکەن؟ ئایا هەروەک جاران وازی لێ بهێنن و ئاردەکە نەبێژنەوە؟یان مەسەلەکە وەک مەسەلەیەکی عورفی سەیربکەن و نەیخەنە بەر تەرازوی ئاین؟.

ئەو ئەساسە چی یە کە ئەو مەسەلانەی پێ تاووتوێ بکرێت؟ هەروەها دەربارەی خانوبەرەو کۆشک و تەلارەکان ، خەڵکەکە ببونە دوو گرۆ، ئایا رێگابدرێت هەرکەسە بەئارەزووی خۆی بکات، یان لەسەر رێ و شوێنی پێشینەکان برۆن؟ هی وا هەبوو پێی وابوو، کە ئەنگوستیلەی ئاڵتون وپۆشاکی دیباج و حەریر بۆ سوڵتان و ئەمیرەکان رەوایە ، نەک بۆ خەڵکی تر، کەچی کاتێک ئیمامی ( عمر ) بیستی کە (سعد بن ابی وقاص) کۆشکێکی لەکوفە دروست کردووەو، پاسەوانی لەبەردەرگا داناوە، وەبێ ئیزن کەس ناچێتە ژوورەوە (محمد بن سلمە)ی نارد تا دەرگای کۆشکەکە بسووتێنێت .

ئەگەر سەیرێکی ئەم دوو هەڵویستە بکەین، بۆمان دەردەکەویت تاچ رادەیەک هەڵوێستەکان لێک جیاوازبوون، جا ئەگەر قسەی پێشینان بەڵگە بوایە، ئەوا ناچار نەدەبوون کە بەرنامەیەکی زانستی یانە دابرێژن، وە بنەمای (اجتهاد) بکەنە باو، بەلام ئەو بەرنامەیە چی بوو؟ خۆ لەوەپیش شتی وەهایان نەهاتبووە پێش، ئەم گرفتە تادەهات پەرەی دەسەند، لەکاتێکدا ئیمامی (عمر) رێگای لە صحابە گەورەکان دەگرت تا مەدینە بەجێ نەهێڵن، کەچی لەسەردەمی ئیمامی (عوسمان)دا رێگەیان پێ درا کە بەناو ولاتانی ئیسلامدا بلاوببنەوە، خەڵکەکە ناچاربوون بکەونە کۆکردنەوەی حەدیس، لە مەشەوە حەدیسی دروستکراو (المختلق) پەیدابوو،کە ئەمەش ئەوەندەی ترگرفتەکەی گەورەتر کرد،

زۆرجار (صحابە ) هەڵوێستیان دەگۆری، بۆ نمونە (ابن مسعود) دەفەرموێت : (إياكم وأرأيت ارأيت . فانما هلك من كان قبلكم بأرأيت ارأيت . ولاتقيسوا شيئا فتزل قدم بعد ثبوتها. واذا سئل احدكم عما لايعلم. فليقل لا أعلم. فأنه ثلث العلم).کەچی پاش ماوەیەکی تر دەفەرموێت :

(انه قد اتي‌علينا زمن ولسنا نقضي. ولسنا هناك. ثم ان الله بلغنا ماترون. فمن عرض عليه قضاء بعد اليوم. فليقض بمافي كتاب الله. وأن جائه امر ليس في كتاب الله ولاقضى به نبيه (ﷺ) فليقض بما قضى به الصالحون. فأن جاءه امر ليس في كتاب الله ولا قضى به نبيه (ﷺ) ولم يقض به الصالحون . فليجتهد رأيه. ولايقل اني ارى واني اخاف. فأن الحلال بين والحرام بين. وبين تلك الامور مشتبهات فدع مايريبك الى مالا يريبك).

بەم شێوەیەئەبینین ئەم زانایە پاش ئەوەی کە نکولی لە قیاس و اجتهاد دەکرد، کەچی بوو بەیەکێک لە ئیمامەکانی (رِا) لەعیراق داو، خەڵکی تریش شوێنی کەوتن، وە لەبەر نەبوونی بەرنامەیەکی ئاشکرا کە راستی یەکان لەچەوتەکان جیابکاتەوە، زاناکان بوون بە دوو گرۆهی دژ بەیەک، هەندێک هەر بەتەواوی دەرگای (اجتهاد)یان داخست، و بەهیچ جۆرێک پێی رازی نەبوون وەک: (عبدالله بن عباس . الزبير . عبدالله بن عمر . عبدالله بن عمرو. سعيد بن المسيب. عروة بن الزبير. عطاء بن ابي رباح. عامر بن شرحبيل).تەنانەت لە (الشعبی)یەوە دەگێرنەوە کە فەرمویەتی: (ماجاءكم به هؤلاء من اصحاب رسول الله فخذوه وماكان من رأيهم فأطرحوه في الحشو).

ئەم دوویەرەکی و ناکۆکی یەو، زۆری گرفت و کێشەکان، وای لە زانایانی ئیسلام کرد کەبەهەموو توانایەکیانەوە هەوڵی چارەسەرکردنی بدەن و، بتوانن بەرلە تەشەنەی گرفتەکەبگرن. ئێستاش ئەرکی ئێمە ئەوەیە کە لەسەر رێ و شوێنەکەی ئەوان برۆین و بەرنامەکەی ئەوان بکەینە سەرمەشق ورێگە بۆ خۆمان .

خوایاریێ لەمەودوا بەدرێژی لەو بەرنامەیە ئەدوێین و بەتەواوی شی ئەکەینەوە.لوتکەی ئەم گرفتە دەربارەی هەڵوێست بوویەرامبەر ئەو گومانانەی کە لەسەر مەسەلە عەقائیدی یەکان بوو، ئەوەش لەدوو رووەوە :.

**یەکەم :**

## شێوەی بەرەنگاربوونەوە

ئ یا واز لە و کەسانە بهێنین؟ یان زۆر بەتوندی بەرویاندابچینەوە؟ یان گوێ لەشوبهەکانیان بگرین ئینجا لەرێگای موناقەشەی زانستی یەوە پووچەڵیان بکەینەوە؟
ئەو باسە عەقائیدی یانەی کە شوبهەکان دەیانگرتنەوە، هەرلەوکاتەی کە موناقەشەکان کەوتنە ئەو باسانەوە، دووبەرەکیش کەوتە ناو موسڵمانانەوە، بەتایبەتی موسڵمانە سادەکان، چونکە بەتەواوی ئاگایان لە مەسەلەکان نەبوو. وە بائاسانی کاریگەریان لەسەریان هەبوو.

(شیخ زاهد الكوثري ) دەنوسێت: (ژمارەیەک لەزانایانی جولەکەو مەسیحی و مەجوس لەسەردەمی راشدین دا موسڵمان بوون و، دەستیان کرد بە بڵاوکردنەوەی ئەو خەرافیاتەی کە لە ئاینی پێشوویاندا هەبوو، هەندێ موسڵمانی سادە بروایان پێ کردن و لەگەڵ ئیسلامەتی دا تێکەڵاوبوو، زاناکان کەوتنە بەربەرەکانیان، وەک ئەوەی (معبد بن خالد الجهمی) ناچاربوو بەگژ ئەوانەدا بچێتەوە کە (قەدەر)یان کردبوو بەهۆی گوناه، وەپێی ئەوتن کە قەدەر مانای ئەوە نییە کە عەبد لەکردنی کارەکانیدا(اختیار)ی نییە، یەکەم کەس کە مەسەلەی ( خلقی) قورئانی داهێنا (الجعد بن درهم الدمشقی) بوو.

(المهدی) فەرمانی دا کە چەند کتێبێک دژ بەوانە دابنرێ کە دەیان ووت: (صیفەتەکانی خوا لە صیفاتی بەندەکان ناچێت) وە ئەو کارەشی بە (معتزله)کان سپارد. ئێستاش پاش ئەوەی باسی هۆکارەکانمان کردو، زانیمان کە گرفتەکە چۆن گەورە بوو، کاتی ئەوە هاتووە کە بەکورتی باسی ئەو بەرنامە زانستی یە بکەین، کە توانی ئەو گرفتە چارەسەر بکات، مەبەستمان لەمەش ئەوەیە: تا ئەوە دووپات بکەینەوە کە لەسەرەتای ئەم نامیلکەیەدا باسمان کرد، کە شوێن کەوتنی (سەلەف) هەر لەبەر ئەوەنی یە کە سەلەف بوون، بەڵکو لەبەر ئەوە بوو کە پێغەمبەر (دروودی خوای لەسەر) خۆی شایەتی بۆ داون و، لەبەر پاکی خۆیان توانی یان بەئاسانی چارێک بۆ گرفتەکە دەستنیشان بکەن، گرنگی ئەم بەرنامەیەش لەوەدایە ، کە تارۆژی قیامەت بۆ هەموو سەدەو رۆژگارێک دەبێت، نەک یەکێک بڵێت کە ئەمە تەنها بۆ (سەلەف) بووەو بۆ چەرخەکانی تر نابێت.

(ابن القیم) لە کتێبی (اعلام الموقعین) دا هەستی بەو گیروگرفتەکردووە، بەلاّم لەجیاتی پەنا بە بەرنامە زانستی یەکە بەرێت هاتووە،راکانی کردووەبە سێ بەشەوە، رایەکی پووچەڵ - رایەکی باش - ئەو رایەی کە گومانی تیایە .

دووەم

# بەرنامە گشتی یەکە

پێشەکی:

مەبەستمان لەبەرنامە چی یە؟ ئەو مەرجانەی کە پێویستە تیایابێت چی یە....... ؟ دیارە مەبەستمان لەووشەی بەرنامە هەر ئەو مانایەیە کە مەبەستی ئەوانەیە ئەم زاراوە بەکاردێنن. واتە ئەو ڕێگایەی کە لێکۆڵەرەوە دەگەینێتە ئەو ڕاستی یەی کە مەبەستیەتی، وە ڕێگای لیّ وون نابێت و نارەوای لیّ نابێتە ڕەوا، جا ئەو راستی یە جاری وا ئەبێت هەواڵێک دەبێت، یان باسێکی زانستی دەبێت، کە بە بەڵگە ڕاستی و ناڕاستی ئاشکرا دەکرێت .

## مەرجەکانیشی .

ئەتوانیت خۆت لەزانینی سروشت و ئەرکەکەیەوە بیان زانیت، بەرنامە هەرچۆنێک بیّ، یەکێک لە سروشتەکانی ئەوەیە، کە ئەبێت بەرنامە بدۆزرێتەوە، نەک دابهێنرێت، واتە: حەقیقەتێکی نەگۆڕەو مرۆڤ هەر لە خۆیەوە بۆی دەچێت. بیّ ئەوەی پێویستی بەوە هەبێت کە بکەوێتە ژێر تەوژمی عەقڵەوە، یان لەرێگەی پەروەردەی خەڵکەکان بۆ وەرگرتنی هاتبێتە کایەوە، ئەوەش جێی گومان نی یە کە زۆر لە (حەقیقەتە)کان شاراوەن و، بەرواڵەت نابینرێن، کەواتە بەرنامە لە قووڵایی بیردا دەدۆزرێتەوە، ئینجا دەکرێت بەچەند عیبارەت و بنەمایەک و، ئەیکات بەچرایەک تارێکای بۆ ڕووناک بکاتەوە.

کەواتە گرنگترین مەرج بۆ ئەوەی بەرنامە ڕاست بێت، ئەوەیە: کە لەناخی بیرەوە هەڵقولابێت و وەک شتە (بەدیهی)یەکان کەخوای گەورە لەبیری مرۆڤدا دروستی کردوون.

هەروەک ووتمان داهێنان هیچ دەورێکی لەبەرنامەدا نی یە، چونکە ئەگەر وابێت، ئەوا ئەو داهێنانەش پێویستی بەبەرنامەیەکی تر دەبوو...هتد

مەبەستمان لەروون کردنەوەی مانای بەرنامە، هەر لەبەرئەوەبوو: چونکە زۆر کەس لەوانەی تازەخوازن، کە دەبینین لەتوانایان دا نی یە ئەو ئەحکامە شەرعی یانە بگۆڕن، چونکە لەسەر بەرنامەیەکی زانستی دارێژراون، ناچاردەبن کە ڕوویکەنە بەرنامەکەو هەوڵی گۆڕانی بدەن، چونکە ئەوان وائەزانن کە ئەو بەرنامەیە بە ئارەزووی خۆیان دایان ڕشتووە، کە ئەمەش هەڵەیەکی گەورەیە، چونکە داهێنانی بەرنامە لەتوانای کەس دا نی یە... پاش ئەم پێشەکی یە دەڵێین:

بۆ ئەوەی مرۆڤ بتوانێت بەراستی و بیّ گومان و دوودڵی ئیسلام پیادە بکات، پێویستە سیّ قۆناغ ببرێت کە ئەمانەن:

أ ـ تەواودڵنیا بێت لە ڕاستی دەقەکان ، چ قورئان چ حەدیس و ، هیچ گومانی نەبێت کە

ئەوانە لەپێغەمبەرەوە وەرگیراون نەک بەدەمیەوە هەڵ بەستراون.

ب ـ زۆر بەووردی لەمانای ئەو دەقانە بگات و، دڵنیا بێت لەوەی کە خاوەن دەقەکە مەبەستیەتی.

ج ـ لەپاشان ئەو مەبەستانەی کە لە دەقەکانەوە وەری دەگرێت، بیخاتە بەر تەرازوی مەنتیق و ئەقڵ، تا بزانێت داخوا ئەقڵ قبولی دەکات؟!

برینی ئەم قۆناغانەش پیویستی بە ئامیریک هەیە، کە ئەویش (بەرنامەیە) کە (صحابە) لەکاتی خۆیدا پیویستی یان پێی نەبووە، بەهۆی نزیکی یان لە سەرچاوەکەوە، کەواتە بەرنامەی زانستی ئیسلامی و، پابەند بە ئەحکامەکانیەوە، لەسێ بەش پێک دێت، کە هەر بەشێکیان خاوەنەکەی دەگەیەنێتە سێ یەکێ رێگاکە.

یەکەم: بریتی یە لە کۆمەڵێک بنەماو زانیاری ، دەربارەی راستی و دروستی حەدیس و ناراستی ئەو حەدیسە.

دووەم: بریتیی یە لەو کۆمەڵە بنەماو زانستیانەی، کە عەرەبەکان بەهۆی ئەوانەوە توانیویانە لەدەقەکان بگەن، کە ئەوەش لە فەرهەنگەکان دا کۆکراوەتەوە دەربارەی مانای وشەو زانیاری یە زمانەوانی یەکان.

سێهەم: بریتی یە لەکۆمەڵێک بنەمای مەنتیقی وعەقڵی، کە لەبەدواداچونی رێژەوی عەقڵی مرۆڤەوە، بۆ زانین پەیرەوی یان دەکات، وە لەبەر ئەوەی کە ئەقل تاکە ئامێریکە کە مرۆڤ بەکاردینێ بۆ هەوڵدان بەرەو زانست، ئەو بنەمایانە بوونەتە تاکە بەرنامە بۆ ساغ کردنەوەی را زانستی یەکان.

لێرەدا وا بەباش دەزانین، کە کورتەیەک دەربارەی بەشی یەکەم و دووەم باس کەین و، بەشی سێهەمیش واز لێ بهێنین، بۆ ئەو سەرچاوە مەنتقی یانەی کە تایبەتن پێی، چونکە لەو بروایەداین کە بەشێکی زۆر لەوانەی کە ئیمرۆ دەربارەی ئیسلام و موسلمانانەوە دەدوین و، سوورن لەسەر ئەوەی کە موسلمانان دابەش بکەن لە (سەلەف و خەلەف) شتێکی ئەوتۆ دەربارەی ئەم بەرنامە ناگادارنین، وە نرخی خۆی نادەنی.





**بەشی یەکەم:**

ئەم بەشە یەکەم بەش بوو کە پێویست بوو گرنگی یەکی زۆر تەواوی پێ بدرێت، ئەوەش لەبەرئەوەی کە ژمارەیەکی زۆر لەوانەی کە توانای ساغ کردنەوەی حەدیس یان نەبوو پەیدابوون، بێجگە لەوانەی کە کەوتنە دروست کردنی حەدیس، لەبەر هەر هۆیەک بێت، ئەوەش بوو بەهۆی پەیدابوونی ناکۆکی لەنێوان موسولمانان دا، دەربارەی چۆنیەتی وەرگرتن لەحەدیسەوە.

بابزانین چ بەرنامەکیان بۆ ئەم کێشەیە دارشت بۆ چارەسەرکردنی ئەم گرفتە.

بۆ ئەم چارەسەرە بریاریاندا کە حەدیس بکرێت بە سێ بەشەوە:

أ... باشترینیان ئەو حەدیسەیە کە بەشێکی زۆر گێراویانەتەوە، کە ئەقل ری نادات ئەو هەموو خەڵکە درۆبکەن. پاشان کۆمەڵێکی زۆری تر ریوایەتیان کردووە، تا گەیشتۆتە نووسینەوە. کە بەم جۆرە حەدیسانە دەوترێت (المتواتر)، هیچ ئەقڵێک توانای نکولی لەم جۆرە نی یەو، ناچارە بروای پێ بکات، چونکە هەموو مەرجەکانی راستی و دروستی تیایەو، هیچ مەجالێکی دوودڵی و گومانی تیانی یە.

ب ..... ئەم بەشە دوای بەشی یەکەم دێت، کە بریتی یە لەو حەدیسەی، کە تاکە کەسێک لە پێغەمبەرەوە گێراویەتەوە. هەر بەم شێوە هاتووە تا نووسراوەتەوە. بەلام ئەوتاکانە پیاوی راستگۆو ووشیار بوون و، زنجیرەی پەیوەندی یەکە نەپچراوەو، دژ بەحەدیسیکی جۆری یەکەم نیە. کە بەم جۆرە دەوترێت (الصحیح) کە ئەقڵی مرۆڤ متمانەی پێ دەکات، بەلام نەک دانی پیابنێت، ئەوەش لەبەرئەوەیە کە مەترسی لە بیرچوونەوەو هەڵەی لێ دەکرێت.

ئەم بەشەی حەدیس نابێتە بەڵگەیەکی تەواو، لەبواری مەسەلە عەقائیدی یەکاندا، واتە ئەگەر کەسێک بروای پێ نەکات کافر نابێت، بەڵگەش لەسەر ئەمە ئەوەیە کە خوای مەزن تەکلیفی شتیک ناکات کە لەتوانادا نەبیت (لایکلفالله نفسا إلا وسعها).

وە عەقیدەش خۆی دەسەپێت، نەک مرۆڤ بە (اختیار)ی خۆی وەریبگرێت، ئەگەر ئەقل وای بینی کە هیچ گومانی لێ ناکات ئەوا وەری دەگرێت، ئەگینا ئەو شتە بەگومانەوە سەیر دەکات، کە ئەمەش هەر لەتوانای مرۆڤ بەدەرە، بۆیە ناتوانین ئەقل ناچار بکەین کە بروای تەواو بەم جۆرە مەسەلانە بکات، چونکە ئەوە مانای ئەوەیە، کە لەتوانا زیاتر تەکلیفمان کردووەوناینی خوا وەها قبوڵ ناکات.

ئەمە دەربارەی مەسەلە عەقائیدیەکان... بەلام مەسەلەکانی تر وەک: (عقارات - معاملات...) ئەوە بەبەڵگەی تەواو ساغ بۆتەوە، کە ئەبێت موسلمان پەیرەوییان بکات،

ئەو بەڵگەیەش ئەوەیە:. کە پێغەمبەر تاکە کەسێکی دەنارد بۆ ئەو شوێنانەی کە تازە ئیسلامی تیا بلاوبۆتەوە، تافیێری ئەحکامی شەریعەتیان بکات، ئەوەشمان زانی کە ئەقڵ هەمیشە لەم جۆرە حاڵەتانەدا گومانی لەبیرچوونەوەو هەڵە بەرامبەر بەو تاکە کەسانە دەکات، لەگەڵ ئەوەشدا پێغەمبەر (ﷺ) فرمانی بەخەڵکی ئەو ناوچانە دەدا، کە پەیرەوی نێراوەکانی بکەن و، سەرپێچی لەفەرمانەکانیان نەکەن.

ج ..... ئەم جۆرە پێی دەوترێت (ضعیف) کە چەند جۆرێکی هەیە بەلاّم هەموویان یەک حوکمیان هەیە.

ئەویش ئەوەیە:. کە نابێت نەلە مەسەلە عەقائیدیەکان داو، نە لە مەسەلەکانی تردا بروایان پێ بکرێت.. لێرەدا رەنگە هەبێت بڵێت: بەچ هۆیەکەوە توانیان ئەم هەموو خەڵکانەی کە ریوایەتی حەدیسیان کردووە بناسن و، بچنە بنج و بناوانیانەوە. رەوشتیان شارەزابن و، هەندێکیان لە ئەوی تر جیابکەنەوەو.

لەوەلاّم دا دەڵێین: خوای مەزن زانایانی حەدیسی رێنمایی کرد، بۆ داهێنانی هونەری (الجرح والتعدیل) کە تائێستا هیچ شارستانیەتێکی جیهانی ئەوەی بەخۆیەوە نەدیوەو، کەسی تریش نەی توانیوە ئەوە بکات، کە بریتی بوو لە کۆکردنەوەی ناوی هەموو ئەوانەی کە ریوایەتی حەدیسی یان کردووە، لەچەند کتێبێک داو، یەکە یەکە بەووردی (دراسە)یان کردوون، کە ئەم کارە لەئەنجامی کۆششێکی یەکجار سەیرو، ماندووبوونێکی زۆرەوە بۆیان ئەنجام دراوە، کە ئەگەر دڵسۆزی و بەتەنگەوە بوونیان بۆ ئیسلام نەبوایە، هەرگیز کاری وا گرانیان بۆ نەدەکرا.



**بەشی دووەم:**

پاش دڵنیابوون لەدەقەکەو ، شێوەی ڕیوایەتکردنەکەی، ئینجا نۆرەی ئەوەیە کە چۆن لەدەقەکە بگەین؟

ئاشکرایە کە هۆی بەشێکی زۆر لەو ئاشوب و گرفتانەی کە پەیدا ئەبوون، لە (اجتهاد)و فتوادا نەبونی تەرازویەکی ئاشکرابوو ، بۆ تێگەیشتنی دەقەکان، ئەمەش وای لەزاناکان کرد ، کە هەوڵی دۆزینەوەی ئەو تەرازوە بدەن، تا لەئەنجام دا توانیان بیدۆزنەوە ، بەوەش کۆڵەکەیەکی تری پتەویان خستە ژێر سەربانی زانینی ئایین و ئەحکامەکانی... ، وا لەخوارەوە باسی ئەو (میزانە) دەکەین و باسەکەمان لەم بەشانەدا روون دەکەینەوە.

**پێشەکی:**

سەرەتای دەست پێکردن بریتی یە لە دەرخستنی ئەو سەرچاوەی، کە بنەماو ئەحکامەکانی ئیسلامی لێ وەردەگیرێت، ئاشکرایە کە ئەحکامی ئیسلامی لەدوو جۆر بەدەرنین، یان هەواڵ و ئاگانامەن، یان فرمان دان و نەهی کردنن، واتە یان ئیخبارین یان (ئینشائین) ، کە ئەمانەش تەنها لەرێگای دەقەکانەوە ئاگاداریان دەبین، مەسەلە عەقائیدی یەکان هەموویان لەشێوەی دەقە ئیختیاری یەکانەوە وەردەگیرێن و ، ئەحکامەکانیش لەشیوەی دەقە ئینشائی یەکان.

ئیمامی شافیعی لەم بارەیەوە دەفەرموێت:

(لەدوای وەفاتی پیغەمبەرەوە (ﷺ) کەس بۆی نی یە لەخۆیەوە ڕا دەربرێت، چونکە لایەنی زانست دوای ئەو ، تەنها قورئان و حەدیس و ئیجماع و قیاسە).. کەواتە سەرچاوەی سەرەکی قورئانەو ، هەرئەمیشە فەرمانمان پێ دەدات، کە ووتەکانی پیغەمبەر بەروون کەرەوەی قورئان بزانین و پشتیان پێ ببەستین. هەروەها لەقورئان دا فەرمانمان پێ کراوە ، کە دوای (اجماع)ی موسوڵمانان بکەوین، وەک ئەفەرموی:

(ومن يشاقق الرسول من بعد ماتبين له الهدى ويتبع غير سبيل المؤمنين. نوله ماتولى ونصله جهنم وساءت مصيرا) النساء/١٥ هەروەها لەچەند ئایەتیکی تردا فەرمانمان پێ ئەدات کە ،لەمەسەلە وەک یەکەکاندا هەمان حوکم بەکاربێنن، کە ئەوەش (قیاس)ە ، وەک (فاعتبروا يا أولي الابصار) الحشر/٢... وە هەروەها حەدیسەکەی (معاذ) کە لەوەوپێش باسمان کرد ، کاتێک پیغەمبەر (ﷺ) ناردی بۆ یەمەن ..

کەواتە دەرکەوت، ئەم چوارە (قورئان، حەدیس، اجماع، قیاس) سەرچاوەی سەرەکی ئیسلامن و قورئانیش سەرچاوەی ئەوانی ترە .

جا هەر موسوڵمانێک لەم بنەمایانە شارەزابوو، گومانی تیا نی یە، کە توانای گەیشتن بە ڕاستی یەکانی ئایینی تیا دروست دەبێت و، تێ دەگات کە ئەم زانستە دەبێت بەدوو بەشەوە:

١- ئەو زانستانەی کە دەبێت هەموو کەس بیانزانێت، کە ئەوەش هەموومەسەلەعەقائیدی یەکان دەگرێتەوە، هەروەها فەرزە سەرەکی یەکان، وەک نوێژو ڕۆژوو حەج وزەکات و، شتە حەرامەکان، وەک: سوود خواردن و ڕیاو دزی و کوشتن.. هتد. ئەمانە بەدەقی قورئان (ثابت) بوون و هەموو کەس دەگرنەوە، بەهیچ جۆرێک ڕێگای بەکارهێنانی (اجتهاد)یان تیا نی یە.

٢- ئەو جۆرە زانستانەن کە تەنها چەند کەسێکی تایبەتی دەگرنەوە، کە بەهۆی خۆ خەریک بونیان بەلێکۆڵینەوەو لێکدانەوە، دەتوانن لەو مەسەلانە بکۆڵنەوە، ئەوانەش بریتین لەمەسەلە (فەرعی)یەکان، کە زانینیان ناگاتە پلەی بێ گومانی ودڵنیایی (یەقین)و داواش لەهەموو کەس نەکراوە کە بیانزانێت و، ئەگەر یەکێک بروایان پێ نەکات (کافر) نابێت، بەڵام لەسەر (عامە)ی موسڵمانان پێویستە کە کاریان پێ بکەن، تا کاروباریان ئەوەستێ و، ژیانی ڕۆژانەیان بە ڕێک و پێکی ئەنجام بدەن، بۆ نمونە: خوا فەرمانی پێ کردووین، کە لەکاتی قەزاوەت دا بەقسەی دوو شایەتی ڕاستگۆ بکەین، ئاشکراشە کە ئیحتمالی ئەوەیان لێ دەکرێت کە ڕاست نەکەن..

جا کاتێک موسڵمانێک دڵنیابوو لەوەی کە قورئان سەرچاوەی هەموو مەسەلە شەرعی یەکانە، دەبێت هەموو هەوڵێکی بخاتە گەڕ، بۆ تێگەیشتنی ئەم کتێبە خوایی یە، لەژێر ڕۆشنایی فەرمودەکانی پێغەمبەرو کردەوەکانیدا.

## کاکڵەکان (الـلـبـاب)

پاش پێشەکی یەکە، ئینجا نۆرەی کاکڵەکە دێت، کە مەبەستمان ئەو بنەما زمانەوانیانەیە، کە هەموو عەرەبی زانێک پێویستە لەسەری ڕەچاویان بکات، بۆ تێگەیشتنی دەقەکان، چ لەڕووی مانای وشەکان، یان ڕستەو عیبارەتەکانەوە بێت..

بەگشتی ئەم بنەمایانەش دەبن بەدوو بەشەوە: (الدلالات - البیان)..

مەبەستمان لە (دلالات) ئەوەیە، کە چۆن وشەکان دەلالەت لەسەر (ماناکان)یان دەکەن ، ئەوەش چوار مەبەست دەگرنەوە:

١. ئەو یاسایانەدەگرێتەوە کە ووشەیەک چەند مانا دەگەیەنێت، واتە دابەش بوون بە (حقیقة - مجاز - مشترك - منطوق - مفهوم)

٢ - ئەویاسایانە دەگرێتەوە کە چۆن ووشەکان لە بواری دەلالات دا دەبن بەچەند پلەیەک ،

لەبێ هیزی و بەهێزی دا وەک (المحکم - المفسر - النص - الظاهر - الخفي - المشکل - المجمل).

٣ـ یاساکانی دابەش کردنی رِستە بەدوو جۆرەکەی (ئیخبار و ئینشاء).

٤ـ یاساکانی گرتنەوەی ووشەیەک (عام - خاص - مطلق - مقید)..

وە مەبەستمان لە (البیان) ئاگاداربوونە لەو بنەمایانەی، کە لەچەند حاڵەتێکی جیاجیادا دەبێت رەچاویکرێت وەک:

١ـ لەکاتێک دا کە ووشەیەکی تایبەتی (خاص) لە بوارێک دا لەگەڵ ووشەیەکی گشتی (عام)دا، لە هەمان بواردا دژ بەیەک دەوەستێ، چۆن بتوانین ئەو دژایەتی یە چارەسەربکەین!

٢ـ لەکاتی دژایەتی لەنیوان (مطلق - مقید)دا چی بکەین؟

٣ـ لەکاتێکدا ناچاردەبین ووشەیەک لەمانا (ظاهر)ی یەکەی لابدەین، دەبێت چ بنەمایەک بەکاربهێنین؟

٤ـ لەکاتێک دا کە ووشەیەکی (مجمل) دەلالەتی ئاشکرا نیە، چۆن بتوانین ئەم تەمومژەی لێ برەوێنینەوە؟

## تەواوکەری (التتمە)

ئەمەش پەیوەندی بەو کەسەوە هەیە کە دەیەویت ئەحکامە شەرعی یەکان لەسەرچاوەکانی وەربگرێت، واتە (مجتهد)ەکان لەگەڵ مەرجەکانی (اجتهاد)و (فتوا)...

ئەمەبوو بەکورتی ئەو تەرازوە، کە رێنمایی موسڵمانان دەکات، کە چۆن پابەندی ئایینەکەیان بن، واتە زانستی (اصول الفقه).

هەرکەسێک پابەندی ئەم تەرازووە بوو، ئەوا پێی دەڵێین: موسڵمانی راستەقینە، چ لەسەردەمی سەلەف دا بژی، یان دوای ئەوان، هەرکەسێکیش پابەندی ئەو رێگایە نەبوو، ئەوە لەئیسلام لایداوە، باهەمیشە لەخزمەت پێغەمبەردا بووبی.

## چەند ڕاهێنانێک لەسەر بەرنامە گشتی یەکە

مەبەستمان لەم بەشەدا ئەوەیە، کە کاریگەری بەرنامە لەسەر ژیانی موسوڵمانان ئاشکرا بکەین و، ئەوە دەربخەین، کە بەهۆی ئەم بەرنامەوە بەتەواوی لەمانای خۆ بەستنەوە بەئیسلام دەگەین..

بۆ دەرخستنی کاریگەری ئەم بەرنامەیە، لەدەستنیشان کردنی ڕێگای ڕاست و چەوت دا، پێویستە بەکورتی پوختەی ئەنجامەکانی بەکارهێنانی ئەم بەرنامە بخەینە بەرچاو کە ئەمانەن:

١. ئەوانەی کە مەجالی ناکۆکی و دوبەرەکی یان تیا نی یە.
٢. ئەوانەی کە هیچ گومانی تیا نی یە کە گومڕایی و لەرێ لادانن.
٣. ئەوانەی کە دوو لایەنەن واتە جێی ململانێی زاناکانن.

ئێستا بەکورتی ئەم سێ ئەنجامانە ڕوون دەکەینەوە..

**یەکەم:** ئەوانەی کە مەجالی ناکۆکی و دوو بەرەکی یان تیا نی یە:.

ئێمە لێرەدا بەشێکیان دەستنیشان دەکەین، لێکۆڵەرەوە دەتوانێت ئەوانی تر کە هەمان حوکمیان هەیە، بۆ خۆی بیاندۆزێتەوە:

١. دەبێت (یەقین)مان هەبێت، کە ئیسلام ئەو ئایینەیە کە خوای مەزن داوای لەبەندەکان کردووە، کە پەیڕەوی بکەن، ئەم ئایینەش هەمووی لەرێگای قورئان و حەدیس و (اجماع)ی موسوڵمانانەوە وەرگیراوە.

٢. دەبێت بێگومان بین، کە خوای مەزن تاک و تەنیایە، چ لەبارەی زاتی خۆی، چ لەسیفات و کردەوەکانی یەوە، بێجگە لەو هیچ دروستکەرێکی تر نی یەو، بێجگە لەو کەس ناتوانێ نەسوود نەزیان بەکەس بگەیەنێت و، هۆیەکانیش کە بەرواڵەت ئێمە بەهۆیان دەزانین ، خوا وای کردوە کەوا دابنرێن...

٣. صیفاتەکانی خوا ، وەک (بیستن، بینین، زانست، توانا، ئارەزوو) هەموویان (ثابتن)و لێی جیا نابنەوە، وەک خۆی (قەدیمن) ووشەکانیشی کلام بەشێکن لەسیفەتەکانی ئەوانیش (قەدیمن).

٤. بێگومانین لەوەی کە کەس لەوێنەی خوا نی یە، لەهیچ شتێکی دا، کە ئەوەش بەشێکە لەیەکتایی ئەو ( لَمْ يَلِدْ وَلَمْ يُولَدْ وَلَمْ يَكُنْ لَهُ كُفُواً أَحَد ) الأخلاص..... هەر شتێکیش کە خۆی وەسفی خۆیی پێ کردبێت ، کە لەرواڵەتدا مانای لەش و هاوتا بگرێتەوە، ئێمە وای بۆ دەچین ، کە خۆی چۆنی مەبەستە وامان بڕوا پێ یەو، گومانمان نیە

کەخوا دووره لەهاوتاو لەش و دانیشتن ، وەک خۆی دەفەرموێت: (الرَّحْمَنُ عَلَى الْعَرْشِ اسْتَوى) طه/٥. وه (وَيَبْقَى وَجْهُ رَبِّكَ ذُو الجَلال وَالأكْـرامْ ) الرحمن/٢٧.( لِما خَلَقْتُ بِيَدَيَّ) ص/٧٥، ( تَجْرِي بأَعْيُنِنا ) القمر/١٤،( وَجَاءَ رَبُّكَ وَالمَلَكُ صَفّاً صَفّاً )الفجر/٢٢، ( وَنَحْنُ اقْرَبُ إلَيْهِ مِنْ حَبْلِ الْوَرِيدْ) ق/١٦.

٥. گومانمان نی یە لەوەدا کە هەموو شتێک دروستکراوی خوایە، چاکەو خراپەو کردەوەی مرۆڤ و ، هەموو ئەوانی تر بەنارەزووی ئەو ئەنجام دەدرێن، هەرچی لەو بەدەربێت دروستکراون و تازە داهاتوون، وەک خۆی ئەفەرموێت:

(قُلْ سِيروا فِي الأرض فَانْظُروا كَيْفَ بَدَأَ الخَلْقَ) العنكبوت/٢٠، (إنَهُ يَبْدَأُ الخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ) يونس/٤، (أَمَّنْ يَبْدَأُ الخَلْقَ ثُمَّ يُعِيدُهُ) النمل/ ٦٤.

٦. بێ گومانین کە هەموو شتێک بەقەزاو قەدەری خوایە، رێنمایی بڕواداران بەلوتفی ئەوەو ، گومڕایی گومڕاکانیش لەژێر دەسەلاتی ئەو دایە. پاش ئەوەی کە هەموو کەس توانای (اختیار)ی دراوەتێ وە، هەموو کارەکانی ڕاست و دادوەری تەواویان تیایە.

٧. گومانمان نی یە کە هەر کەسێک بنەماکانی ئیمان و ئیسلام لەدڵ و عەقڵی دا جێگیر بوبێت، ئەوا بەهۆی گوناهەوە کافر نابێت، گوناهەکە هەر چۆنێک بێت بەمەرجێک پێیی وابێت ئەو کارە حەرامە، بەلام ئەگەر گوناهێکی کردو بڕوایشی وابوو کە ئەو کارە حەرام نی یە ئەوە کافر دەبێت وەک لەقورئانا دەفەرموێت:

(إنَّ اللهَ لايَغْفِرُ أنْ يُشْرَكَ بِهِ وَيَغْفِرُ مادُونَ ذَلِكَ لِمَنْ يَشَاءُ ) النساء/ ٤٨، (وآخَرُونَ مُرْجُونَ لأمْرِ الله إمَّا يُعَذِبُهُمْ وَإمَّا يَتُوبُ عَلَيْهِمْ وَاللهُ عَلِيمُ حَكِيمْ) التوبة/١٠٦.

٨. دڵنیاین و هیچ گومانمان نیە ، کەموسوڵمان لەرۆژی (قیامەت)دا خوای خۆیان بەچاو دەبینن، وەک چۆن مانگی شەوی چواردە دەبینن.. (وجُوهٌ يَومَئِذٍ نـاضِرَةٌ إلى رَبِّـهَا نَاظِرَةٌ) القيامة/٢١-٢٢، بەلام کافران لەو نیعمەتە بێ بەشن، وەک ئەفەرموێ : (كَلا إنَهُمْ عَنْ رَّبهِمْ يَوْمَئِذٍ لَمَحْجُوبُونْ) المطففين/١٤، ئێمە لەو بڕوایەداین، کە ئەو بینینە بەشێوەیەکە کە لایەق بەزاتی پەروەردگار بێت، و خواش توانای هەیە کە هێزێکی بینینی وا لەموسوڵمانانادا دروست بکات، کە بەئاسانی بتوانن خوای خۆیان ببینن..

٩. ئێمە گومانمان لەوەدا نی یە، کە مرۆڤ دوای مردنی فریشتە پرسیاری لێ ئەکەن و، بڕوامان بەئازاری ناو گۆڕو، خۆشی و ناخۆشی ئەوێ هەیەو، پێمان وایە مرۆڤ زیندوو

نەکرێتەوە، ئەوەیش بە لەش و گیان دەبێت، هەروەها بڕوامان بە (حساب - میزان- صراط) هەیەو بێگومانین، کە بەختەوەران لەبەهەشتداو، پیاو خراپان لەدۆزەخ جێگیر دەبن، وە گوناهبارە موسوڵمانەکان پاش ئەشکەنجەدان لەدۆزەخ دەردەهێنرێن و پێغەمبەر ( ﷺ ) بۆ تاوانباران تکاکارەو شەفەعات ئەکات ، کە ئەمەش تەنها تایبەتە بەو، وە کەس توانای پارانەوەی نی یە بۆ یەکیکی تر، مەگەر بەرەزامەندی خوا نەبێت..

١٠. بێگومانین لەوەی کە پێویستە ئەو پێشینانەمان خۆش بوێت، کە خوای مەزن هەڵی بژاردوون، تابینە هاورێی پێغەمبەرو، ئەویش شایەتی پایە بەرزی بۆ داون و، هەروەها چوار خەلیفەکە (ابوبکر، عمر، عثمان، علی) بەو تەرتیبەی کە خەلیفە بوون، کارێکی دروست و بێ کەم و کووری بووە، باشترین بەڵگەش ئەوەیە کە ئیمامی (علی) بەیعەتی بە هەر سێ خەلیفەکەی پێش خۆی کردووە، بەمەش دەردەکەویت، کە بەئیمامەتەکەیان رازی بووە. بەم بەڵگەیە زیاتر ئاشکرا دەبێت لای ئەو کەسانەی کە پێیان وایە ئەهلی (بیت) کە ئیمامی (علی) یەکێکیانە (معصومن) لەگوناه، کەواتە بەیعەتی حەزرەتی(علی) بۆ ئەو خەلیفانە، دەبێتە دەقیکی شەرعی، لەسەر ئەو تەرتیبە، ئاشکرایە کە ئەگەر بوترێت ئیمامی(علی)معصومەو لەهەمان کاتدا بوترێت کە خەلیفەکانی پێش ئەو، بەناحەق بوون بەخەلیفە، ئەوە دوو قسەی دژ بەیەکن و، بەهیچ جۆرێک ئەقل قبوڵی ناکات.

ئێمە لەباسکردنی کێشەی ناو هاورێکانی پێغەمبەرﷺ ، خۆمان دوور دەخەینەوەو، پێمان وایە، خەلیفەکانی ڕاشیدین ڕاستگۆو بەرز بوون و، کەسێکی تر ناگاتە پلەو پایەیان.

١١. ئێمە بێ گومانین کە یەکێک لە هەرە بەرزترین ئامانجی ئیسلام، کۆکردنەوەی موسولمانانە لەسەر بنەماکانی ڕێی ڕاست و، پێویستە موسوڵمانان هەموو ڕێگایەک بگرنە بەرلەو پێناوەدا، وەک: نوێژی بەکۆمەل - جەماعەت و جومعەو - جەژن، نوێژی جەماعەت لەدوای هەموو موسوڵمانیکەوە دروستەو، پێویستە موسوڵمانان لەفرمانی سەرکردەکانیان نەچنە دەرەوە، با نیشانەکانی (فاسقی)یان لێ دەربکەویت، بەڵام پێویستە ئامۆژگاریان بکەین و، ئەمر بەچاکەو نەهی لەخراپە بکەین بەپیشەمان بەپێی توانا.

١٢. بڕوامان بەهەموو نیشانەکانی ڕۆژی (قیامەت) هەیە چ ئەوانەی قورئانی پیرۆز باسی کردوون، چ ئەوانەی کە پێغەمبەری مەزن هەواڵیانی ڕاگەیاندوە، وەک هاتنی (دجال)و هاتنەوەی (عیسا)و (یأجوج و مأجوج)و (دابة الأرض) و، بڕوامان وایە کە

حەزرەتی (عیسا) نەکوژراوە و نەمرە، بەڵکو خوای مەزن کردویەتی بەیەکێک لەنیشانەکانی (قیامەت)و، کاتێک دیتەوە سەر زەوی حوکم بەقورئان و حەدیس ئەکات و، (خاچ) دەشکێت و بەراز دەکوژێ و، هەموو میللەتان لەسەر حەق کۆ دەکاتەوە، پاشان خوای مەزن دەی مرێنێ و، بە پێی ئەو بڕیارە گشتی یەی کە کەسی لی بەدەر نی یە (إنك میت و إنهم میتون) الزمر/٣٠.

١٣. بڕوامان وایە کە نوێ کاری (الابتداع) لەئایینی خوادا کارێکی دژ بەئایینە، جا چ لەبواری مەسەلە عەقائیدی یەکانیان دا بێت، چ لەبواری مەسەلە خواپەرستی یەکان دا بێت، بەهیچ جۆریک نابێت هیچ شتێک لەئاین زیاد بکرێت، بەلام نوێکاری لەبواری ژیانی رۆژانەو، زانست و جم و جۆڵە کۆمەلایەتی یەکاندا، ئەوە پەیوەندی هەیە بەسودو زیانی موسوڵمانانەوە.

١٤. پێمان وایە ئەو چوار ئیمامەی کە خۆیان بەنوسینەوەی ئەحکامی شەریعەتەوە خەریک کردووە (شافعی، احمد، مالک، ابو حنیفە) بەرای گشتی هەموو موسولمانان پایە بەرز بوون و، پلەیەکی بەرزیان لەزانستی شەرع و (اجتهاد)دا هەبوە، وە زۆر بەووردی لەمەسەلەکان کۆلیونەتەوەو. هەر کەسێکیش کە توانای (اجتهاد)ی نەبێت، بۆی هەیە شوێن یەکێکیان بکەوێت، چ پابەندی یەکێکیان بێت یان نا، بەلام کاتێک ئەو کەسە توانای ناگابوونی شەریعەتی بۆ پەیدا بوو، وە توانای دەرهێنانی حوکمی لەسەرچاوەکان هەبوو، ئەوا بێجگە لە(اجتهاد) هیچ رێگایەکی تری لەبەردەم دا نی یە.

١٥. بێگومانین کە هەوڵدان بۆ زانست و پڕ کردنێ هۆش و بیر لەزانستە جۆراو جۆرەکان، کارێکی شایستەو رەوایە، بەمەرجێک ناگای لەوە بێت، کە بەرژەوەندی یە تایبەتی و ئارەزووە کەسی یەکانی خۆی، نەخاتە پێش حەق و عەدالەتەوە، خۆی بەزانستی (سیحر)ەوە خەریک نەکات، چونکە ئەم زانستە بەپێی رای گشتی موسولمانان (الاجماع) حەرامە، کارێکی خراپەو، قورئان و حەدیس نکولی یان لێ کردووە... لەدەربارەی زانستی مەنتیق و فەلسەفەشەوە، چەند رایەک هەن کە لە بەشی سێهەمی ئەم نامیلکە باسیان دەکەین.

١٦. گومانمان نی یە ئەو ئایینە راستەی کە خوای مەزن بۆی داناوین، لە سێ بەش پێک دیت (ایمان، اسلام، احسان).

**ئیمان :** کاکڵەی ئایینەو، بریتی یە لەوەی کە بەیەقین بڕوامان بەخواو فریشتەو کتێبەکانی خواو پێغەمبەران و رۆژی دوایی و قەزاو قەدەر بەچاکەو خراپەیەوە هەبێت..

**ئیسلام :** بریتی یە لەدیاردە دیارەکانی مرۆڤ (الظواهر الأنسانية) وەک ووتنی:

شایەتومان ( شەهادە ) - نوێژکردن - رۆژوو گرتن - حەجی مالّی خوا بۆ تواناداران (ئەم دووانە ئیمان و ئیسلام) دوو شتی سەربەخۆن بەنیسبەت ژیانی دنیای مرۆڤەوە.

هەموو موسڵمانێک بەباوەڕ دار دائەنرێت بەبێ جیاوازی، بەڵام لەرۆژی دوایی دا دوو شتی پابەندو پێکەوە بەستراون ، واتە: موسوڵمانی بێ ئیمان، یان ئیمانداری بێ ئیسلام لای خوا قەبوڵ نین و، لەسزای خوا پارێزراو نابن، چونکە پێغەمبەر ﷺ داوای لەهاورێکانی دەکرد، کە تەنها بەمەسەلە رواڵەتی یەکان حوکم بکەن و، نهێنی یەکان بدەنە دەستی خوا (نحن نحكمُ بالظواهر) .

زۆر جار ئیمامی عمر کە لەکاتی محاکەمەیەکدا گومانی پەیدا دەکرد ئەیفەرموو: من حوکم بەوە دەکەم کە بەرواڵەت بۆم دەرکەوتوەو، نهێنی و (باطن) بۆ خوا بەجێ دێڵم، چونکە ئیمان شتێکی شاراوەیە لەحاڵەتی مرۆڤ دا، لەبەر ئەوە ناچارین بەپێی رواڵەت معامەلەی لەگەڵدا بکەین ئەویش ئیسلامەتیەکەیەتی .

**ئیحسان :** ئەمە بەرزترین پلەی مرۆڤە لەبواری ئایین دا وە ئەوەیە کە پێغەمبەر(ﷺ) ئاماژەی بۆ کردووە ( أن تعبد الله كأنك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك ) ئەوەش بەوە دەبێت کە یەقینی ئەقڵی ئەو کەسە بەخوا، بەسەر هەموو هەست و ئەستیا زاڵ ببێت و، هەموو شتەکانی ئەم جیهانە، ببنە بیرخەرەوەی خواو، وای لێ بێت لەدیتنی هەر دروستکراوێکدا گەورەیی و سیفاتە جیا جیاکانی خوای تیادا بەدی بکات، لەکاتی نوێژدا هیچ پەردەیەک لەنێوان خۆی و خوای خۆیدا نەبینێ ...

رێگەی گەیشتن بەو پلەیە ئەوەیە: کە نەفسی خۆی پاک بکاتەوەو، خۆی بەڕژیانی ئەم دونیایە نەبەستێتەوە، وە هەمیشە لەیادی خوادا بێت و، دژایەتی ئارەزووە نەفسی یەکانی بکات و، بۆ گەیشتن بەم پلەیەش دەتوانێت، هەموو هۆ مەشروعەکان بەکار بهێنێت، بەمەرجێک لەشەقامی راستی قورئان و حەدیس لانەدات، زۆر گرنگە کە ئەوەی پێشینەکان دەیان زانی، ئێمەش بیزانین، ئەوەش ئەوەیە:- کە ناتوانرێت پارێزگاری لەئیمان بکرێت، مەگەر لەناو قەڵای سەختی ئیحسان دا نەبێت، چونکە هەر کەسێک هەوڵدان بۆ گەیشتن بەم پلەیە ئیهمال بکات، نابێت لەوە دڵنیا بێت، کە ئیمانەکەی لەئەنجامی گەردەلوولی ئارەزووەکان بەسەلامەتی دەردەچێت.

ئەمانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن، دیاری ترین بنەماو ئەحکامن کە هەموو موسوڵمانان لەسەریان یەک ڕان و، هەر کەسێک پابەندی ئەو بەرنامەیە بێت، کە لەوەو پێش باسمان کرد، ئەوا بۆی دەردەکەوێت، کە ئەمانە هەموویان لەرێگەی بەڵگەوە لە

دەقەکان وەرگیراون، لەژێر رۆشنایی ئەو بنەماو مەرجانەدا، کە لەبەرنامەکەدا باسمان کردن، خۆ ئەگەر لەبەر ئەوە نەبوایە کە نامەوێت لەباسەکەمان دوور بکەوینەوە، ئەوا بەدرێژی باسی بەڵگەکان و دەقەکانمان دەکرد، وە بەئاشکراو بەپێی بنەماکانی بەرنامەکە، یەکەیەکە مەسەلەکانمان روون دەکردەوە، بەڵام ئەوە وامان لێ دەکات کە لەمەبەستە سەرەکییەکەمان دوور بکەوینەوە..

پێویستە لێرەدا ئاماژە بۆ ئەوە بکەین، کە لەو بنەماو ئەحکامانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن، هی وایان هەیە ئەگەر یەکێک بڕوای پێ نەبێت کافردەبێت، هەشیانەوانی یە، وەک ئەوانەی کە لەرێگای (اجماع)ەوە بۆمان هاتووە.. بۆ نمونە: نکولی لەئیمامەتی (ابوبکر- عمر) کە رای بەشێکی زۆری شیعەکانە، بەکوفر دانانرێت، هەروەها رای معتزلە کە پێیان وایە (مرۆڤ خۆی کردەوەکانی خۆی دروست دەکات) کوفر نی یە، هەروەها یەکێک بەتەواوی لەمانای (ئیحسان) نەگات و بەگرنگی نەزانێ کافر نابێت...

بەڵام ئەوەی کە گومانی تیا نیە، ئەوەیە کە نکولی لەوانەی سەرەوە، ئەگەر کوفریش نەبێت، ئەوا بە(فسق) دادەنرێت و، لادانە لەرێگای راست. چونکە نکولی لەوانە مانای لادانە لەبنەماکانی بەرنامە زانستی یەکەو، جا ئەگەر پشت بەستن بەبەرنامەکە رای هەموو زاناکان بێت، ئەوا پابەند بوونیش بەئەحکامەکان رای هەموویانە .............

## ئەوانەی کە هیچ گومانی تیا نیە کە گومرایی و لەرێ لادانن

هەروەک چۆن پێوەرمان بۆ ئەو شتانەی کە گومان لەراستیان نیە، بەرنامە زانستی یەکە بوو، هەرواش پێوەرمان بۆ ئەو شتانەی کە بەگومرایی یان دادەنین، هەر هەمان بەرنامەیە، ئاشکراشە ئەم جۆرە، ئەو مەسەلانە ناگرێتەوە کە زاناکان رایان لەسەری (متفق) نەبوە، چونکە ئەوانە لەبەشێکی تری ئەم کتێبەمان باسی دەکەین... ئەوەی لێرە دەمانەوێ باسی بکەین، چەند نمونەیەک لەلادانن، کە ناگەنە پلەی کوفر، چونکە ئێمە پێمان وایە حوکم بەکافر بوونی خەڵکان، کارێکی هەروا ئاسان نی یە...

ئەم لادانەش بەرای ئێمە، لەئەنجامی دەمارگیری، یان ئینکاری هەقیقەتی ئیسلامەوە هاتووە، جاری وا هەیە هەڵگێرانەوەی دەقێک بەجۆرێک، کە هیچ عەقڵێک قبوڵی ناکات، بۆتە هۆی ئەو گومرایی و لەرێ لادانە..

بۆ نمونە: نکولی لەئیمامەتی(دوو خەلیفە) حەزرەتی [أبوبکرو عمر]و، بریاردانی صیفاتی پیغەمبەرایەتی، بۆ ئیمامی عەلی و، کەم کردنەوە لەپلەی چەند صەحابەیەک، بەشێکن لەو دەمارگیری یەی کە باسمان کرد.. هەروەها ئەوەی، کە چەند دواکەوتوی شێخیک بۆ شیخەکەیانی بریاردەدەن، کە پێیان وایە کردەوەی ئەو بەڵگەیە بۆ دەقەکانی شەریعەت نەک دەقەکانی شەریعەت، بەڵگەن بۆ هەموو کارێک، کە ئەمەش پێچەوانەی هەموو راستی یەکی ئاشکرای ئایینە.

هی وا هەیە پێی وایە، کە لەبنەماڵەی پێغەمبەردا کەسانی وا هەبوون، گەیشتونەتە پلەیەک کە لەپلەی فریشتەو پێغەمبەران بەرزتر بووە. وەک ئیمام خومەینی لەکتێبی (الحکومة الأسلامیة)دا دەڵێت:-

[ (یەکێک لەشتە ئاشکراکانی مەزهەبەکەمان ئەوەیە، کە ئیمامەکانمان پلەو پایەی وایان هەیە، کە هیچ فریشتەیەک یان پێغەمبەرێک نای گاتێ.

وە لەزمانی ئەوانەوە ریوایەت کراوە: (ان لنا مع الله حالات لایسعها ملك مقرب ولا نبي مرسل) ئەم پلەیەیش (فاطمة الزهراء) بوویەتی ].

هەیە پێی وایە، یەکێک گوناهی گەورە بکات پێی کافر دەبێت و، لەرێی ئایین وەردەگەڕیت، وەک (خەواریج)ەکان تەنانەت هەندێکیان وەک (الأزارقة) پێیان وایە، ئەگەر ئەو گوناه کردنە بەهەڵەش بوبیت هەر وایە، بەپێچەوانەی ئەمانەوە (المرجئه) دەڵێن: لەگەڵ ئیمان دا هیچ گوناهێک زەرەری نی یە، لەوانە (یونس بن معون)، (ابو معاذ لتونی، (بشر المریسی) ئەمانەش هەمووی لە ئەنجامی زیادەرەوی یەوە (الغلو) هاتووە، ئەگینا

وە نەبێت هیچ بەڵگەیەک یان دەقێکیان بەدەستەوە بێت، جاری وا هەیە بۆ سەپاندنی ڕاکەیان، پەنایان بۆ درۆو دانانی حەدیس بردووە.

بەشێکی تر لەم ڕاگومڕایانە، پەیوەندی بەهەڵگێڕانەوە (تأویل) هەیە، بەجۆرێک کە هیچ بنەمایەکی زمانەوانی پێی ڕازی نیە، وا لێرەدا نمونەی چەند بەشێک لەوانە دەنوسین: تەئویلی ئایەتەکانی صیفات بەجۆرێک کە ئەو صیفاتانە لەخوا دوور دەخەنەوە، کە بۆ خۆی (ئیسپاتی ) کردوون، وەک لەئایەتی (بَلْ يَداهُ مَبْسوطَتان) المائده/ ٦٤، یان (الرحمن علی العَرْش إسْتَوى) طه/ ٥، یان (وَجَاءَ رَبُّكَ وَالمَلَكُ صَفَّاً صَفَّاً) الفجر/٢٢، ئەمەش تەنها بەنیازی ئەوەی، کە (تجسیم) لەخوا دور بخەنەوە. کەچی دەکەونە هەڵەی تێکدانی مانای ئایەتەکان، (معتزله) پێیان وایە موسوڵمانان لەقیامەت خوای خۆیان نابینن، وە ئایەتی (وجوه يومئذ ناضرة الى ربها ناظرة) (تأویل) دەکەن و دەڵێن: ووشەی (ناظرة) بەمانای (منتظرة)یە ، ئاشکرایە کە ئەمە هەڵەیەکەو هیچ پاساوێکی نیە، یان دەڵێن: ووشەی (رسول) لەئایەتی (وماكنا معذبين حتى نبعث رسولاً) الأسراء/١٥، بەمانا عەقڵە، ئەوەش تەنها بۆ ئەوەی، ئەو ڕایەیانی پێ بسەپێنن کە دەڵێت: ئەگەر عەقڵ کارێکی بەباش یان خراپ زانی، پێویستە مرۆڤ بەقسەی بکات، با لە پێغەمبەریشی نەبیستبێ. بەڵام ئاشکرایە ئەو ووشەیە ئەو مانایە هەڵناگرێت، چونکە چەندەها ئایەتی تر لەقورئاندا ووشەی (رسول)یان تیایەو، بەو مانایە بەکار نەهاتوون، وەک:- (رسُلاً قد قصصناهم عليك من قبل ورسلاً لم نقصصهم عليك) النساء/ ١٦٤.

بەشێکی تر لەو جۆرە (تأویل)انە ئەوەیە:- کە زۆر لەوانەی بەناوی (تصوف)ەوە قسە نەکەن ئەو تەئویلانە دەکەن وەک (الآلوسي) لەتەفسیرەکەیدا لەزمانی ئەوانەوە دەیگێڕێتەوە، کە مەبەست لە(مجمع البحرين) کۆمەڵگەی شێخەکەیەو (الصخرة) نەفسی مرۆڤەو (الحوت)ەو، مرۆڤی دونیا نەویستەو، (السفينه) شەریعەتەو، (خرقها) واتە وازی لەڕواڵەت هێناو، ڕوی کردە (باطن)و، (الغلام) نەفسی خراپە...

یان یەکێکی تریان ووشەی (العصا) لەئایەتی (قال هي عصاى اتوكأ عليها) الكهف١٨ بەمانای جیهان لێک داوەتەوە ..

ڕۆژ هەڵات ناسەکان زۆر بەکەیف خۆشیەوە ، دەڕواننە ئەم جۆرە کارانە ، بۆیە کۆیان دەکەنەوەو کتێبەکانیان ، پێ پڕ دەکەنەوەو، خۆشیان هەندێکی تری دەخەنە پاڵ ، ئەوەش

تەنها بەمەبەستی عەیب گرتن لەئیسلام، (جولد تهر) دەڵێت: سۆفی یەکان پێیان وایە (القریە) لەئایەتی (وأضرب لهم مثلا اصحاب القریـة) یـس/١٢ بـەمانای لـەش هـاتووەو، سێ نێرراوەکەش گیان و دڵ و ئەقڵن.

هەر چۆنیک بێ، ئێمە پیمان وایە کە نابێت ئەم جۆرە تأویلە پوچەڵانە بدرێنە پاڵ سـۆفی یەکان، چونکە هەموو لێکۆڵەرەوەیـەک دەزانێت، کـە بەشێکی زۆر لەزندیقـەکان، ڕاکـانی خۆیانیان هێنایە ناو ئیسلامەوە لەرێگای (تصوف) ە وە، بەڵام لەحەقیقەتدا زۆر لەوانـەوە دوور بـوون، بـەڵام (تصـوف)ی ڕاسـتەقینە کاکڵـەی ئیسـلامەو، دەچێتـە قوڵایـی دڵـی موسوڵمانەوە، کە بەهۆی ئەوەوە ئومێدو تـرس بەسـەریا زاڵ دەبیـت و، لەهـەموو چڵکیکی پیسی رق و کینەو خۆشەویستی دنیا پاک دەبێتەوەو، هەمیشە ئاگای لەخوای خۆیـەتی و، پابەندی شەریعەت و، ئەحکامەکانیەتی ،وە بەلای حەرامەکاندا ناچێت و، ئەرکەکانی جـێ بەجێ دەکات و ،مافی بەندەکان دەپارێزیت...

باشترین پێشەوای ئەمانە پێغەمبەرە ﷺ ئینجا هاورێکانی و، نابێت مەسەلەی ناونان سەرمان لێ تێک بدات، چونکە ناونان گرنگ نی یە کردەوە گرنگە، لەسەرەتای ئیسلام دا چونکە هەموو کەس بەڕاستی ئیسلا م بوون، پێویست بەناویکی تر نـەبووە، بـەلام کـاتیک ووشەی ئیسلام بەوانەش دەوترا کـە هـەر بەڕوالـەت ئیسـلام بـوون، هـەندێک وایـان بـەباش زانـی کـە ئەوانـەی بـە (حەقیقـەت) ئیسـلامن و هیـچ کـەم و کورریـەکیان تیـا نـی یـە، ئـەو ناوەیان لێ بنین، کە ئێمە پیمان وایە لەم رۆژەدا ئـەتوانین وازی لـی بـهێنین، بـەڵام نـابێت ئەوەمان لـەبیر بچێت کـە ئەوانـەی ئـەم نـاوە دەیانگریتـەوە، کەسـانێکن کاکڵـەو جەوهـەری ئیسلامیان هەڵگرتووەو، خۆیان بەڕوالەت و (شـکل)یاتـەوە نەبەسـتۆتەوە، چونکـە دڵنیـان لـەوەی کەئەوانـەی سـودیان بـۆ کـەس نـەبووەو، هـەرگیز سـودیان نـابێت، ئەمانـە زۆر لـەوە بەرزترن کە بەناوی سۆفیێ تیـەوە یـاری بـەقورئان بکـەن، بەڵکوبەپێچەوانـەوە تـادێت زیـاتر پابەندی دەقەکانی دەبن و، زۆر بەترسەوە دەروانـنە تەفسیر کردنی، بـۆ نمونـە: ئەگـەر سـەیری تەفسیری (القشیری) بکەین، کە یەکێکە لەپێشەوا هەرە بەرزەکانی سـۆفی یـەکان، بـۆت دەردەکەویت کە چەند بەتەنگ بنەماکانی تەفسیرەوە بووەو، چۆن خۆی لـەو جۆرە (تأویلانە) دوور گرتووە، وە لەئامیلکەیەکی دا زۆر بەتوندی خەڵکان لـەلادان لەشـەریعەت ئەترسێنی و، شەریعەتیش تەنها هەر ئەوەیە کە لەدەقـەکانی قورئـان و حەدیسـەوە وەرگیـرابێ. ڕەنگـە کەسـانێک هـەبن بـەناو خۆیـان بەسـۆفی دەزانـن و، یـاری بەدەقـەکانی شـەریعەتەوە دەکـەن، ئەمانە هیچیان لەوانە کەمتر نیە، کە یاری بە(فقه) دەکـەن و، ئەحکامـەکانی دەشـێوینن، کە هەردووکیان خراپن و لادەری رێگای حەقیقەتن.

ئیستاش وا لەخوارەوە چەند نمونەیەک لەو (تأویلانە) باس دەکەین، کە بەهیچ شێوەیەک لەگەل ئەو بەرنامە زانستی یە یەک ناگرێتەوە، کە ئێمە بەدریژی باسمان کردو، مەرجەکانمان روون کردەوە، زۆر لەفەیلەسوفە ئیشراقی یەکان پێیان وایە، کە نەوعی (مادده) هەر بووە، واتە قەدیمە، دەلین (حەشر)ی لەش ناگرێتەوەو، خواش ئاگای لەشتە بچووکەکان نی یە، جا ئەم رایانە ناچاری کردوون، کە زۆر لەدەقەکان (تەئویل) بکەن، بۆ نمونە: ئایەتی (كما بدأنا أول خلق نعيده) (الانبياء/١٠) وە ئایەتی (إنه يبدأ الخلق ثم يعيده) (يونس/٤) بەلگەیەکی ئاشکران، کە دروست کردن دوای نەبوونە، کەچی ئەوان دێن و تأویلی وای دەکەن، کە مادام (خلق) سیفەتێکی (قەدیمە) دەبێت دروست کراوەکەش (قدیم) بێت، ئەی ووشە (بدأ ـ و ـ یبدأ) چی لێ دەکەن؟

ئەم ئایەتەش بەلگەیەکی ئاشکرایە، کەزیندو بوونەوە بۆ لەشەکانە، کە ئەفەرموێت (وضرب لنا مثلا ونسي خلقه قال: من يحي العظام وهي رميم، قل يحييها الذي أنشأها أول مرة، وهو بكل خلق عليم) (يس /٧٨،٧٩).. یان ئایەتی: (أيحسب الانسان أن لن نجمع عظامه بلى قادرين على أن نسوي بنانه) (القيامة/٢/٣/٤).

ئەم ئایەتەش بەلگەیەکی ئاشکرایە، کە زانستی خوا هەموو شتە گەورەو بچوکەکان دەگرێتەوە (لايعلمها إلا هو، ويعلم مافي البر والبحر وماتسقط من ورقة إلايعلمها، ولاحبة في ظلمات الارض ولا رطب ولا يابس إلا في كتاب مبين) (الانعام / ٥٩)

ئەمڕۆ کەسانی وا دەبینین، کە لەقسەی ئیشراقی یەکانەوە نزیک دەبنەوەو، پێیان وایە کە ئازاردانی کافران، ئازاردانێکی رەوانی یەو هیچی تر، جا ئەگەر ئەو ئایەتانەیان بەرەو روو بکرێتەوە، کە بەئاشکرا باسی ئەوە دەکەن، کە ئازاردانەکە بۆ گیان و لەشە، ئەوا بەجۆرەها (تأویل) ئەو ئایاتانە (تأویل) دەکەن دەبێت بەرامبەر بەم ئایاتانە چی بکەن؟

(كلما نضجت جلودهم بدلناهم جلودا غيرها) (قل إن الاولين والاخرين لمجموعون إلى ميقات يوم معلوم. ثم إنكم أيها الضالون المكذبون لآكلون من شجر من زقوم فمالئون منها البطون. فشاربون عليه من الحميم، فشاربون شرب الهيم. هذا نزلهم يوم الدين) (الواقعة/٤٩/٥٦) .

هەروەها زۆر لەزاناو لێکۆلەرەوەکان، کاتێک کە دەبینن ئایەتێک لەگەلْ ژیانی رۆژئاواو رۆشنبیریاندا ناگونجێت، هەر لەبەر خاتری ئەوان ئایەت و حەدیسەکان (تأویل) دەکەن، وەک بلێیت هەستی رۆژئاوایی یەکان پێوەری راستی و ناراستی شتەکان بێت، بۆ نمونە

دەڵێن: (الملائکە) لەئایەتی (إذ تستغیثون ر بکم. فاستجاب لکم أني ممددکم بالف من الملائکة مردفین)

بەمانای گیانی ورەو مەعنەویات بەرزکردنەوەیە، ئاشکرایە کە ئەم وشەیە بەهیچ جۆرێک ئەو مانایە هەڵناگری، ئایا کەس بیستویەتی کەشتێکی مەعنەوی بژمێررێت وەک: (٥٠) پەنجا خۆشەویستی یان هەزار ڕاستی و .... کەواتە ئەمە بێجگە لەیاری کردن بەقورئان هیچی تر نی یە..

هەر لەم بوارانەدا هەندێک (طیراً ابابیل)ی سوورەتی فیل بەنەخۆشی ئاولە لێک دەدەنەوە، بەڵام ئێمە دەپرسین ئاخۆ هیچ عەقڵێک ئەوە قبوڵ دەکات، کە خوای مەزن ئاولە بەو شێوە ناو بیات ؟ .

جائەگەر ئەوە ڕاست بێت، کە سوپاکەی ئەبرەهە بەئاولە لەناوچووین، ئەوا مانای ئەوەیە کە پێغەمبەر(د.خ) بەڵگەیەکی ئاشکرای بەدەستی خۆی داوەتە دەست کافرەکانی (مەککە) تا بەدرۆی بخەنەوە، چونکە زۆر کەس لەوانەی بەچاوی خۆیان ئەو ڕوداوەیان بینی بوو لەژیان مابوون، کەچی هیچ کەس نەچوو پیغەمبەر بەدرۆبخاتەوە، چونکە بەچاوی خۆیان ئەو باڵندەیان دی بوو..

سەرەڕای ئەوەش هەموو هاوەڵەکانی سەردەمی (جاهلی) باسی ئەم ڕووداوەیان کردووەو تەنانەت شاعیرەکان شیعریان بەسەردا هەڵداوە..

خۆ ئەگەر بۆ پشتگیری لەو (تأویلە) بوتریت، ئەی ئەوە نیە میژوونووسەکان باسی بڵاوبوونەوەی نەخۆشی ئاولە لەناو سوپاکەی ئەبرەهەیان دا کردووە؟

ئێمە لەوەڵام دا دەڵێین:.

ئەو شتە ڕاستەو زۆر لەمێژوونوسان ئاماژەیان بۆ کردووە، تەنانەت لە (یعقوب بن عتبە) وە گیرراوەتەوە:

کە بۆ یەکەم جار ئاولەو سوریژە لەو ساڵەدا پەیدا بوون. بەڵام کەس ئەوەی نەوتووە کە وشەی (طیرا ابابیل) بەمانای ئاولەیە، کەواتە ئاولەکە شتێکی تربووە، کە خوا تووشی کردوون.

هەروەها وشەی (الدجال) کە زۆر لەحەدیسەکان باسیان کردووەو، گەیشتۆتە پلەی (التواتر) (تەئویل)ی دەکەن بۆ شارستانیەیەتی ڕۆژئاوا، داهێنراوە تازەکان،کە بەهیچ جۆریک لەگەڵ دەقە حەدیسی یەکان یەک ناگرێتەوە، ئەوەتا لەحەدیسێکدا وەسفی ئەکات بەم شێوەیە : (انە شاب قطط عینە طافئة کأني اشبهە بعبد العزي بن قطن فمن أدرکە منکم

فليقرأ عليه فواتح سورة الكهف انه خارج خلة بين الشام والعراق فعاث يمينا وعاث شمالا يا عبادالله فأثبتوا) یان ئەو دەقانەی کە باس لە(عیسا)وە دەکەن (تەئویل) دەکەن واتە دەڵێن مانای (مُتَوَفیکَ) لەئایەتی (أنـي متوفيك ورافعك الي ) بەمانای: ئەمرێنم و، مانای (رافعک) واتە پلەت بەرز دەکەمەوە. تێبینی ئەوەیان نەکردووە کە وشەی (إِلَيَّ) بەو حیسابەی ئەوان بێت دەبێت پلەکەی لەگەڵ پایەو پلەی خوادا یەکسان بێت، ئاشکرایە هەر ئەوە بەسە بۆ ئەوەی بڵێین ئەو تەئویلە هەڵەیە..

مانای ڕاستی ئایەتەکە بەم جۆرەیە (ڕۆژانی ژیانی سەرزەویت کۆتایی پێ دێنم و، بەرزت ئەکەمەوە بۆ ئاسمان) کە ئەمەش مردن ناگرێتەوە کەیەکێکە لەمانا (مجاز)ی یەکانی (الوفاة) باشترین بەڵگەش لەسەر ئەوە ئایەتی (وقولهم انا قتلنا المسيح عيسى ابن مريم رسول الله، وماقتلوه وماصلبوه، ولكن شبه لهم وان الذين اختلفوا فيه، لفي شك منه مالهم به من علم الا اتباع الظن، وماقتلوه يقينا بل رفعه الله اليه) (النساء/ ١٥٧،١٥٨) مانای ئاشکرای ئەم ئایەتە ئەوەیە، کە نەیانتوانیوە بیکوژن، پاشان ووشەی (بل) لەزمانی عەرەبیدا دەکەوێتە نێوان دووشتی دژ بەیەکەوە، بۆ نموونە ناوترێت (من برسيم نى يه بەڵکو دانیشتووم) بەڵکو دەوترێت (بەڵکوتێرم)، کەواتە ئەمە بەڵگەیەکی ئاشکرایە، کەنەکوژراوەو ئێستا زیندووە، ئەم ئایەتەش دیسان هەر ئەوە دوپات دەکاتەوە (وان من اهل الكتاب الا ليؤمنن به قبل موته ويوم القيامة يكون عليهم شهيدا) النساء/١٥٩. مەبەست لە (اهل الكتاب) ئەوانەن کە لەکاتی هاتنەوەی بۆ سەر زەوی، نیشتەجێی زەوین، لەو کاتەدا هەروەکو زۆربەی حەدیسەکان دووپاتیان کردۆتەوە.

پێمان وایە ئەو نمونانەی سەرەوە بەس بن و، پێویستمان بەنمونەی تر نەبێت، بەڵام با بپرسین، ئایا هۆکاری ئەم لادانەو دەرچوون لە بەرنامە زانستی یەکە لەو مەسەلانەی سەرەوەدا نەبێ چی بێت؟

لەوەڵام دا ئەڵێین: دووهۆکاری سەرەکی وایان کردووە کە ئەو کارە بکەن.

هۆکاری یەکەم

زیادەڕەوی لەبەکار هێنانی عەقڵ و، زاڵبوونی بەسەر دەقەکاندا و، کێشانی بەرەو مەسەلەی نادیاری وا، کە تەنها لەژێر ڕۆشنایی حەدیسی بێ گوماندا نەبێت، کەس بۆی نی یە بچێتە ناویانەوە.

ئەوەش یەکێک بوو لە دیار ترین هەڵە بەرنامەییەکان ، کەبیری ( اعتزال) تێی کەوت و

خۆی خستە ژێر کاریگەری فەلسەفەی یۆنانی یەوە، ئەو فەلسەفەی کە لەبەر نەبوونی دەق ناچار بوو، تەنها پشت بەعەقڵ ببەستێت، لەبەر ئەوە ئەبینین کە (معتزلە)کان کەوتنە ئەو هەموو هەڵەوە، کە لەمێژووی ئەواندا بەدی دەکرێت، تەنانەت ئەمڕۆش زۆر لەوانەی کەرواڵەتی شارستانیەتی رۆژئاوا چاوی کوێر کردوون ئەو شارستانیەتەی کەتەنها بڕوای بە(مادده) هەیە، دەکەونە هەڵەی گەورە گەورە، کە ئەبینن ئەو شارستانیەتە بڕوای بەنهێنی یەکان (الغیب) نیەو، پێی وایە سرووشت (الطبیعة) فەرمانڕەوای رەهایە بەسەر ئەم جیهانەدا، ئەوانیش کاتێک دەبینن دەقێک باس لەشتە غەیبیەکان دەکات، ناچار دەبن بکەونە (تەئویل) کردنی و، لەمانا راستەقینەکەی خۆی لای بدەن، کە بەمەش دەیانەوێت وا لەعەقڵ بکەن، کەزیاتر لەتوانای خۆی هەڵبگرێت (تحمله مالا طاقة له).

هۆکاری دووەم:

بریتی یە لەو هەست و ویژدانەی، کە بەسەر گیانی سۆفی یەکاندا زاڵ دەبێت و، دەیانباتە ناو خەیالاتی (باطن)ی دوور لەدەقەکان و مانا ئاشکراکانیان و، کاتێکیش لەگەڵ دەقەکاندا رووبەروو دەبنەوە، ناچار دەبن بکەونە (تەئویل)یان، بەشێوەیەک کە لەگەڵ بۆچونەکانی ئەواندا بگونجێت.

لێرەدا ئەوەی گرنگە بوترێت، کە ئەو گومرایی و لەرێ لادانەی لەسەرەوە باسمان کردن، لەوە نەهاتوون کە پێچەوانەی رای پێشینانەکان بوون، چونکە لەناو ئەوانیش دا هی واهەبووە، ئەو لادانەی کردووە وەک (معتزلە)، هەروەها ئەو بنەماو حەقیقەتانەی کەباسمان کردن بەوەی هیچ گومانیان تیا نی یە، لەبەرئەوە نی یە کە سەلەفەکان لەسەر ئەو رێ و شوێنە رۆیشتوون، چونکە زۆر لەوانەی کە لەچەرخی ئەوان دا ژیاوون، لەگەڵ بەشێک لەو بنەمایانەدا نەبوون.

کەواتە گومان لەوەدا نیە، کەراستی و ناراستی ئەو بنەمایانە، تەنها لەوەوە دێت کە ئایا کامەیان لەژێر رۆشنایی بەرنامە زانستییەکەدا هاتونەتە کایەوەو، کامەشیان دژ بەو بەرنامەیەن، واتە مەسەلە چەرخی کۆن و تازە نیە، مرۆڤ لەهەرچاخێکدا بژی بەمەرجێک پابەندی ئەو بەرنامەیە بێت، ئەوا رێگای راستی گرتووەو، هەر کەسێکیش وانەبێت ئەوا خۆی دەخاتە ناوگێژاوی گومرایی و سەر لێ شێوانەوە..

کەدەڵێین پێشینانەکان لەخەڵکی تر پایە بەرزترن، لەبەر ئەوە نی یە چونکە لەو چەرخانەدا ژیاوون، بەڵکو تەنها لەبەر ئەوە بووە، کەپابەندی بەرنامەکە بوون، سەرەڕای ئەوەش کە لەپێغەمبەرەوە نزیک بوون، کە ئەمەش گرنگی یەکی تایبەتی هەیە... ئەم راستی یەش ئەوەندەی تر ئاشکرا تر دەبێت، کاتێک کە باسی ئەو مەسەلانە دەکەین، کە

لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو ووردبوونەوە، زاناکان نەیانتوانیوە یەک ڕابن لەسەریان، بەهۆی (اجتهاد)ی جیاجیانەوە، بەڵام وەنەبێت لەبەرنامەکە لایان دابێت...



## ئەو مەسەلانەی کە لایەنی ڕاستی و ناڕاستیان ساغ نەبۆتەوە

لەم بەشەی کتێبەکەماندا باس لەو نموونانە دەکەین، کە بەپێی ئەو بەرنامانەی باسمان کردن نەتوانراوە بەتەواوی ببڕێنرینەوە، ئەوەش لەئەنجامی ئەوەی کە لەکاتی جێ بەجێ کردندا ئەگەری ناکۆکی ڕوو بەڕوویان بوەتەوە.

هەر ئەو نموونانەش بوونەتە هۆی ئەوەی، کە ئەوانەی خۆیان بە(سەلەفی) دادەنێن، کردویانن بەبەربەستێک لەنیوان خۆیان و نویێ خوازاندا، بەجۆرێک کە ڕاو بۆچوونەکانی خۆیان دەکەنە بەڵگەنامەیەک، لەسەر ئەوەی، کە هەر ئەمان مافی ئەوەیان هەیە کە سەر بەو پێشینانە بن و، کەسی تر ئەو مافەی نی یە، بەڵام هەروەکو باسمان کرد، ناکۆکی یەکە لەئەنجامی بنەماکانی بەرنامە زانستی یەکەوە پەیدا بووە، کەواتە کەسیان بۆی نی یە خۆی بەراست بزانێ و لایەنەکانی تر بەهەلە بزانیت.

وا لەخوارەوە باسی ئەو نموونانە دەکەین، کە دابەشمان کردوون بەسێ بەشی سەرەکی یەوە:-

١ـ ئەو دەقانەی کە ماناکانیان ئاشکرا نی یە (المتشابهه).

٢ـ نوێ خوازی و حوکمی و باس کردنی (البدعه).

٣ـ تصوف و گیروگرفتەکانی.

## یەکەم: دەقە نادیارەکان و ئایات و صیفاتی ـ

لەوەوپێش ئەوەمان ڕوون کردەوە، کە زاناکان یەک ڕان لەسەر ئەوەی، کە ئەبێت ئەو دەقانە وا لێک نەدرێنەوە، کە بۆنی کوفریان لێ بێت و، ناش بێت مانای زمانەوانی یان پەک بخرێت، واتە نەبێت بەشێوەیەک (تفسیر) بکرێن، کە نەبێتە هۆی ئەوەی شەریک و هاوڕێ بۆ خوا پەیدا بکرێت، وەک ئەوەی لەمانای {أستوی علی عرشه}دا نەبێ بوترێت: دانیشتنێکە کە لایەق بەگەورەیی و تاک و تەنهایی ئەو بێت، یان بوترێت (الأستواء) لێرە بەمانا قودرەت و دەسەلاتە، هەروەها لەمانای (ید الله فوق ایدیهم) ووشەی (ید) بەمانا هێزە، وە لەئایەتی (بل یداه مبسوطتان ینفق کیف یشاء) المائدة/٦٤ بەمانا کەرەم و بەخششە.

ئێمە لیرەدا ناچاربووین، کە ئایەتەکان (تەئویل) بکەین، چونکە ئەگەر مانا زمانەوانی یەکان وەربگرین، ئەبێت بڵێن کە خوا (جسمی) هەیەو دەستی هەیە، کە ئەویش دروست نی یە، لەبەر ئەوە بەدوو جۆر (تەفسیر)مان کردن، یەکەمیان بەشێوەیەکی (اجمالی)، دووەمیان بەشیوەیەکی (تفصیلی)، پێشینەکان هەر بەشێوە (اجمالی)یەکە وازیان هێناوە، وە خۆیان توشی گێرەو کیشەی (استعارەو مجاز) نەکردووە.

(سەلەفی یەكان) دەڵێن: مادام ئەو پێشینانە پێویستی یان بە(تأويل ی تفصيلی) نەبووە، لەبەر ئەوە بەكارهێنانی ئەو جۆرە (تەئویلانە) جۆرێكە لەجۆرەكانی پەكخستن (التعطيل).

ئێمە لەوەلامیاندا دەڵێین: ئەوە ڕاست نی یە كەدەڵێن پێشینان (تەئویل)ی ئەو ئایەتانەیان بە(تفصيلی) نەكردووە، چونكە بەڵگەی زۆر هەن، ئەوە دەردەخەن، كە ئەوانیش زۆر جار بەو شێوەیە تەئویلیان كردوون.

ئیمامی ئەحمەد لەمانای ئایەتی (وجاء ربك والملك صفا صفا) الفجر/٢٢.
ئەفەرموێت: {جاء أمر ربك}. هەروەک لەئایەتی (أو يأتي أمر ربك) النحل/٣٣. هەروەها لەحەدیسی ئەو (ئە نصاری)یەی كە زۆر ڕێزی لەمیوانەكەی پێغەمبەر (ﷺ) گرت و، خۆی و ژنەكەی بەسكی برسی یەوە سەریان نایەوە. پێغەمبەریش فەرمووی: (لقد ضحك الله الليلة من فعالكما) ئیمامی بوخاری مانای (ضحك)ەی بەبەزەیی هاتنەوە كردووە.
(البيهقي) لە(حماد بن زياد)ەوە دەگێڕێتەوە، دەربارەی ئەوەی كە خوا دێتە خوارەوە بۆ ئاسمانی یەكەم، كە لەچەند حەدیسێک دا ووتراوە، ئەو زانایە مانای (النزول)ی بەوە كردووە: واتە ڕوو دەكاتە بەندەكانی.

(ابن تيمية) لەئیمامی (جعفر الصادق) دەگێڕێتەوە، كە ووشەی (الوجه) لەئایەتی (كل شئ هالك الاوجهه) القصص/٨٨ بەمانا ئایینە.

(الضحاك) دەڵێت مانای زاتی خواو بەهەشت و جەهەنەم و عەرشە.

بەڵام خوودی (ابن تيمية) پێی وایە باشترین مانا ئەوەیە كە بوترێت (الوجه) بەمانای (الجهه) بەكار هاتووە.
(البيهقي) لەتەفسیری ئایەتی (و لله المشرق والمغرب فأينما تولوا فثم وجه الله)دا (البقرة/١١٥) دەڵێت: شافیعی فەرموویەتی: (فثم الوجه الذي وجهكم الله اليه)..

(مجاهد)یش فەرمویەتی: (الوجه) بەمانا قیبلەیە.

(ابن حجر) دەفەرمێت: زۆربەی زانایانی تەفسیر دەڵێن: ووشەی (استوى) لەئایەتی: (الرحمن على العرش استوى) (طه/٥) بەمانای (ارتفع)ە بەكار هاتووەلەم نموونانەی سەرەوە، بۆت دەركەوت كە (سەلەفە) كانیش بەشێوەی ( تفصيلی) تەفسیریان كردوون تەنانەت ( ئیبن تیمیە ) كەگوایە ئەو جۆرە تەفسیرانەی بەباش نەزانیوە ، ئەویش ئەوەی كردووە

دەبێت تێبینی ئەوەش بکرێت، کە ئەو جۆرە (تەئویلانە) بەهیچ شێوەیەک دژ بە بەکارهێنانی زمانەوانی، یان بنەماکانی عەقیدە نین، بەڵکو جاری واهەیە بەئایەتێک بەڵگەیان هێناوەتەوە وەک تەفسیرەکەی ئیمام ئەحمەد، ئەوەش کە بوترێت تەفسیر کردنی ئەم ئایەتانە بەشێوەی (تفصیلی) جۆرێکە لەجۆرەکانی پەکخستن، لەوەلام دا دەڵێین:-

ئەو نموونانەی کە لەسەرەوە باسمان کردن، باشترین بەڵگەن لەسەر ئەوەی کە ئەو قسەیەش راست نی یە، چونکە هەرگیز ئەوانە کاری وا ناکەن، کە مانای ئایەتێک پەک بخەن، گریمان ئەوان ئەو جۆرە (تەئویل)انەیان نەکردووە، ئەوە نابێتە بەڵگە کە ئەو کارە حەرامە، رەنگە ئەگەر هەندێکیان ئەوەیان نەکردبێت لەبەر چەند هۆیەکی تر بوو بێت، وەک ئەوەی: ترسی خوا لەدڵیانا جێگیر بووەو، بارودۆخ و دەوروبەریش پێویستی بەو جۆرە موناقەشانە نەبووە.

کەواتە دەرکەوت، کە (تەئویل) نەکردنی ئەوان، نابێتە بەڵگە، کە ئەوان بەحەرامیان زانیوە، لە هەموو شتێکیش گرنگتر ئەوەیە کە تەرازوی راستی لە هەموو بارێک دا مەسەلەی زمانی عەرەبی یە، کە زمانی قورئان و حەدیسە، دیارە هەموو کەسیش توانای زاڵ بوونی بەسەر بنەماو یاساکانی ئەو زمانەدا نی یە، وە هەر (اجتهاد)ێک لەسنووری زمانەوانی و بنەماکانی عەقیدەی ئیسلامی یەوە هەڵقوڵابێت، کارێکی راستە، چونکە لەبەرنامە زانستی یەکەی لانەداوە، بەمەش دەردەکەوێت، کە پابەند بوون بەرای (سەلەف) هیچ پێویست ناکات، چونکە رای (مجتهد)ێک لەگەڵ یەکێکی تردا جیاوازە، وە ئاشکراشە کە شتەکان بەپێی گۆرانی چەرخەکان دەگۆرێن.

بۆ نموونە (البیهقی) لە(الخطابی)یەوە ریوایەت دەکات، کاتێک حەدیسی (أنس) دەربارەی بەهەشت و دۆزەخەوە باس دەکات (لاتزال جهنم تقول: هل من مزید، حتی یضع رب العزة فیها قدمه فتقول قط قط) دەڵێت: [زاناکانی پێشوو بێ هیچ تەئویلێک ئەم حەدیسەیان گێراوەتەوە، ئێمەش دەبوایە هەر وامان بکردایە، بەلام ئێمە کەوتوینەتە چەرخێکەوە، خەڵکەکەی بوون بەدوو بەشەوە: بەشێکیان هەموو حەدیسێکی لەم جۆرە بەدرۆ دەدەنە قەڵەم، وە نکولی لێ دەکەن، کە ئەوەش مانای بەدرۆخستنەوەی ئەو زانایانەیە کە ریوایەتیان کردوون، دیارە کە ئەوانەش واسیتەی نێوان ئێمەو پێغەمبەرن (ﷺ) بەشێکی تریش بروایان پێیانە، تەنانەت ئەگەر بەروالەت بگاتە حەددی (تشبیه)، لێرەدا ئێمە ناچارین هەردوو بۆچوونەکە رەت بکەینەوەو (تەئویل)یان بۆ بکەین، کە لەگەڵ بنەماکانی ئایین و مەزهەبی زاناکاندا بگونجێت، پێمان وایە (قدم) لەم حەدیسەدا بەمانا

ئەو کەسانەیە، کە خوا بڕیاری داوە بچنە دۆزەخەوە،وەک لە ئایەتی (أن لهم قدم صدق عند ربهم) یونس/٢ . کە بەمانا ئەو کردەوە باشانەیە کە کردوویانە ...

ئەوەتا زانایەکی وەک (الخطابی) کە لەسەدەی چوارەمدا ژیاوەو، زۆر نزیک بووە لەچەرخی (سەلەف) کاتێک ئەبینێ کە زەمانە گۆڕاوەو، بەڵگەی زمانەوانیشی بەدەستەوە بووە ناچار بووە، تەئویل بکات، کاتێکیش کەبینویەتی مەجالی تەئویل نیە وازی لێ هیناوە.

بۆ نموونە: دەربارەی حەدیسەکانی (نزول) دەفەرمویت : پێویستە وەک خۆی بروامان پێی بێت ، وە نەچینە بنج و بناوانی یەوە، کەچی لەحەدیسی(اتی رسول الله ((ﷺ)) اعرابی فقال: یارسول الله، جهدت الأنفس وضاعت العیال فقال رسول الله ( (ﷺ): ویحك أتدري ما الله؟ ان عرشه علی سمواته لهکذا، وقال بأصبعه، مثل القبة علیه وانه لینط به اطیط الرجل بالراکب).. دەفەرمویت : ئەگەر وەک خۆی حەدیسەکە مانا بکەین، بەجۆرێک لەچۆنیەتی (الکیفیة) دەگەیەنێت، کە ئەوەش بۆ خوا نابێت، بۆیە نەبێت بوترێت: مەبەست لێرە نزیک کردنەوەی شتەکەیە لەئەقڵی ئەعرابی یە نەزانەکە، کە ئەڵێ: (ما الله) واتە (ماعظمة الله) وە مانای (انه لینط به) واتە (انه لیعجز عن جلاله وعظمته حتی ینط به). لێرەدا بۆمان دەردەکەویت کە ئەم زانایە، خۆی بەرای (سلف)ەوە نەبەستۆتەوە، بەڵکە بەپێی بارودۆخ و بەڵگەکان ڕەفتاری کردووە، وەک لەسەرەوە ئاماژەمان بۆ کرد، وەلام دانەوەی عەرەبێکی دەشتەکی، جیاوازە لەگەڵ (مناقشە)ی زانایەکی رۆشنبیردا.

ئەنجامی ئەمانەیش ئەوەیە، کە بۆچوونەکانی (سەلەف و خەلەف) نابێتە بەڵگەی تەواو لەسەر تەفسیری ئایەتەکانی صیفات، بەڵکو بەڵگەی ڕاست و دروست ئەوەیە، داخۆ چەند لەگەڵ بنەما گشتی یەکانی ئاین و زمانەوانی دا دەگونجێت.

جا لێرەدا (اجتهاد) دەوری خۆی دەبینێت، ئەوەتا لەمانای (کل شئ هالك الا وجهه) القصص/٨٨، سێ ڕامان باس کرد، یەکێکیان هیچ (تەئویل)ی ناکات، دووەم: دەڵێت: (الوجه) واتە (الذات) سێهەمیش دەڵێت: (الوجه) واتە (الجهة)ە.

پێویستە ئەوەش بزانین، کە هیچ ڕایەک لەو ڕایانە زاڵ نی یە بەسەر ڕاکەی ترداو، نابێت ببێتە هۆی ئەوەی کە موسوڵمانان بکاتە پارچە پارچەو، یەک ریزی یان تێک بدات، چونکە مەسەلەکە پەیوەندی بە(اجتهاد)ەوە هەیەو، هەمووشیان پابەندی بەرنامە زانستی

یەکەن و، لەو بنەمایانە لایان نەداوە، جا ئەگەر یەکێک پێی وابیت، کە بەشێکیان ڕێی ڕاستیان گرتووەو، بەشەکەی تریش گومرایە ئەوا دەکەوێتە هەڵەیەکی گەورەوە...

لێرەدا لەباسی ئەو مەسەلانەی کە ڕاست و ناڕاستیان ساغ نەبۆتەوە دەوەستین و، ئەوەش دووپات دەکەینەوە، کە ناکۆکی لەسەریان نابێتە هۆی گومرایی هیچ لایەنێکیان و، یەک ڕیزی یان تێک نادات.

## دووەم: پێناسەو حوکمی بیدعە

ئەم بنەمایە لە هەردوو بنەماکەی تر فراوانترە، چونکە ئەگەر بەووردی سەرنجی بنەمای یەکەم و سێیەم بدەین، بۆمان دەردەکەویت کە ئەوانیش جۆریکن لە(بدعە)، هەرچەند لێرەدا مەبەستمان لە(بدعە) ئەو جۆرەیە کە ئەوانە نەگرێتەوە.

پێشەکی: دەمانەوێت ئەوە ڕابگەیەنین، کە ڕای گشتی موسوڵمانان و دەقەکان ئەوەیە، کە (بیدعە) گومرایی یەو پێویستە خۆمانی لێ دوور بخەینەوە، وە داهینان لەئاین دا ترسناکترین گوناهە، کە نابێت هیچ موسوڵمانیک بەلای دا بچێت، بەڵگەشمان ئەم ئایەتە پیرۆزانەیە:

(أم لهم شركاء شرعوا لهم من الدين مالم يأذن به الله) الشورى/٢١.

(ولاتقولوا لما تصف ألسنتكم الكذب هذا حلال وهذا حرام لتفتروا على الله الكذب) النحل/١١٦.

یان حەدیسی (من أحدث في امرنا ماليس منه فهو رد..) (ان خير الحديث كتاب الله وخير الهدى هدى محمد وشر الأمور محدثاتها وكل بدعة ضلالة)..

## بابزانین (بیدعە) بەچی دەڵێن:

بەزۆر واتا باسی (بدعە) کراوە، بەڵام ئەوەی کە هەموو باسەکان تیایدا هاوبەشن، ئەو پێناسەیەی ئیمامی (الشاطبی)یە، کە تەنها ئەوانە دەگریتەوە، کە هەموو موسولمانان لەسەریان یەک ڕان، کە (بیدعە)یەو خواو پیغەمبەر نکولی‌یان لی کردوون، ئەوەش ئەوەیە کە لە(الاعتصام)دا دەلیت:

(بیدعە): (بریتی یە لەڕیرەوێکی ئاینی، داهێنراو کە وەک شەریعەت وایە، بەمەبەستی زیادەرەوی لەخوا پەرستی دا). بێگومان بدعە کاریکی حەرام وخراپەو، هەر شتێکیش بەناوی ئاینەوە داهێنرابیت، چ لەمەسەلە عەقائیدی یەکاندا بێ، یان لە(عیبادات) شتێکی (بیدعە)یەو، کارێکی ناڕەوایەو (حرام)ە، بۆ نمونە: زیاد کردنی نوێژێکی تر لەسەر پێنج فەرزەکە، یان بەڕۆژو بوونی ڕۆژێکی تایبەتی، کە لە قورئان و

حەدیس دا نەبێت، یان تەنها یەک جۆر خواردن بەناوی خواپەرستی یەوە، یان بەرز کردنەوەی دەنگ بەخوێندنەوەی زیکرو شیعر لەگەل (جەنازە)دا، یان بانگ دان لەکاتی مردوو خستنە گۆڕەوە، یان بڕوا بوون بەوەی کە دۆزەخ تەواو دەبێت و، ئازاری کافران کۆتایی دیت، یان ئەوەی بوتریت کە دۆزەخ تەنها بریتی یە لەپەشیمان بوونەوەو سەر شۆری.. ئەمانە هەموویان (بیدعە)ن و پابەند بوون پێیان گومرایی یە.

ئەی بابزانین ئەوەی کە جێگای ململانێی زانایانە، کام جۆرەیەتی و، ململانێکە لەسەر چی یە؟

ناکۆکی یەکانیان تەنها دوو شت دەگرنەوە:-

١. نەریت و خووە کۆمەلایەتی یەکان:

ئەگەر (بیدعە) بەوە بلێن کە هەر عادەتیک بەپێچەوانەی ئەو عادات و تەقالیدەوە بێت کە صەحابە کاتی خۆی بویانە، ئایا ئەو نەریتە نوێیانە بەگومرایی دادەنرێن یان نا؟

لەوەلام دا پێویستە بوترێت: کاتی خۆی تەنانەت (صەحابە)یش لەسەر ئەو مەسەلەیە یەک ڕا نەبوون، هەیان بووە پێی وابووە کە نابێت بەهیچ جۆریک عاداتی نوێ دابهێنریت نە لەبارەی خواردنەوە، نە لەبارەی جل و بەرگ و خانوبەرەو.. هتد/هەندێکیشیان پێیان وابووە کە ئەمانە (بیدعە) نین و نابنە هۆی گومرایی، چونکە ئەمانە شەرع نین، لەبەرئەوە موسولمان دەتوانێت بەئارەزووی خۆیی و بەپێی گۆڕانی بارودۆخ و شوێن، عاداتی نوێ ڕابهێنیت و، لەپیشەکی ئەم کتێبەدا لەم بارەوە دواین و، نموونەی زۆرمان باس کرد، هەر لەبەر ئەمەش بووە کە لەمانای (بیدعە)دا ڕای جیاوازیان هەبووە.

٢. تەتبیق کردنی مانای (بیدعە) بەسەر ڕوداوو شتی جوزئی دا.

ئاشکرایە لەکاتی تەتبیق کردندا، ململانێ دەکەوێتە نێوان زانایانەوە، بۆ نموونە: باس کردن دەربارەی قەزاو قەدەرو (جبرو اختیار) دەرهەق بەمرۆڤ، ئایا بە(بیدعە) دادەنرێن یان نا؟؟...

یان بەکارهێنانی زانستی (کلام و منطق) لەبەرگری کردن لەعەقائیدی ئیسلامی دا (بیدعە)یە یان نا؟ ڕوویەڕوو بوونەوەی ئەوانەی دەیانەوێت ئیسلام لەکەدار بکەن، دروستە یان نا؟ کێشە دەربارەی قورئانی پیرۆز، کە ئایا هەموو شتێکی قەدیمە یان ووشەکان و مەرەکەب و کاغەزو بەرگەکەی، جیاوازن لەمانا (نفسی)یەکەی؟. ئایا (بیدعە)یە یان نا؟. پەنا بردنە بەر پێغەمبەرو پاڕانەوە لێی پاش وەفاتی، یان هەر پیاو چاکێکی تر کارێکی ڕەوایە یان نا؟. زیادە لەعیبادەتدا چۆنە، چ شتیک بەزیادە دادەنریت و بەحەرام لەقەلەم دەدرێت و، چ جۆریکی وانی یەو کارێکی باشە؟ ئەو بانگەی کە ئیمامی (عثمان)

دای هێنا کاتێک شاری مەدینە گەورە بوەو ، ئەو بانگەی کە لەبەردەم مزگەوت دا دەدرا ، نەی ئەتوانی هەموو کەس ئاگادار بکاتەوە ، ئایا بدعەیە یان نا ؟. ئیحرام بەحەج و عومرە لەغەیری ئەو شوێنانەی کە بۆیان دیاری کراوە ، کارێکی باشە یان نا ؟ بیدعەیە یان نا ؟
نوێژی جەژن لە چەرخی پێغەمبەر ( ﷺ )دەبوو لەدەرەوەی شار بکرایە ، ئەگەر لەناو مزگەوتدا بکرێت حوکمی چی یە ؟ بیدعەیە یان نا ؟ ئەمانە هەمووی چەند نموونەیەکن بەتەواوی ئاشکرا نەبووە ، ئاخۆ بەرمانای (بیدعە) دەکەون یان نا ؟ لەبەرئەوە هەموویان دەکەونە ژێر حوکمی (اجتهاد)ەوە ، وە زانایانی (سەلەف) لەسەریان یەک ڕانەبوون ، وا لەخوارەوە بەدرێژی سەرلەنوێ لی یان ئەدوێین:

## دەربارەی ناوەکانی خواو صیفاتەکانی و

## ( کلام) و ( قەزاو قەدەر )

ئاشکرایە کە لەسەرەتای هاتنی ئیسلامەوە (صەحابە) بەهیچ جۆرێک لەو مەسەلانەیان نەدەکۆڵیەوە ، وەک چۆن لەقورئان و حەدیس دا باسیان کرابوو وەریان دەگرتن و ، بروایان پێیان بوو ، بەلام پاش وەفاتی پێغەمبەر ( ﷺ ) وە بلاو بوونەوەی ئیسلام ، بەپانتایی یەکی فراواندا ، وە موسوڵمان بوونی ژمارەیەکی زۆر لەجولەکەو مەسیحی و ئایینەکانی ترو ، پەیدا بوونی (دەردەشەو گفتو گۆ) لەنێوان ئەمان و (صەحابە)کاندا ، موسوڵمانەکان بوون بەدوو بەشەوە: هەندێکیان ووتووێژ دەربارەی ئەو مەسەلانەیان بەکارێکی خراپ دەزانی و ، هەروەک جاران بێ دەنگی یان هەڵبژارد ، لەمانە حەزرەتی (عمر بن الخطاب، عبدالله بن عمر. زید بن ثابت) وە کەسانی تر... پاش ئەوانیش لەتابعین (احمد بن حنبل، مالك بن أنس. الأوزاعي. سفیان الثوری) هەمان ڕایان هەبوو. هەندێکی تریش پێیان وابوو کە پێویستە وەلامی ئەو کەسانە بدرێتەوەو (مناقشە)یان لەگەڵدا بکرێت، لەمانە (علی بن ابی طالب، عبدالله بن عباس، عبدالله بن مسعود) وە لەپاش ئەوانیش لەتابعین (الحسن البصری، أبو حنیفة، الحارث المحاسبي، ابو ثور..) ڕای ئەمانیان هەبوو.
ئیمامی علی زۆر جار لەگەڵیاندا دەکەوتە (مناقشە)وە ، وە (ابن عباس)و (ابن مسعود)ی هان دەدا تاوەلامیان بدەنەوە . وا لەخوارەوە دوو هەڵوێستی دژ بەیەک لەلایەن دوو زانای گەورەی ئیسلامەوە ، کە بەناودارترینی زانایانی (سلف) دادەنرێن باس دەکەین:

یەکەم: ئیمامی (مالک بن انس)ە:
کە ئەیفەرموو نابێت بەهیچ جۆرێک گوێ بۆ ئەو جۆرە کەسانەی کە (شوبهە) لەئیسلام دەگرن بگیرێت و، هەموو جارێک ئەوەی دووبارە دەکردەوە، وە ئەیفەرمو: (ایاكم والبدع. قيل يا أبا عبدالله وما البدع؟ قال: أهل البدع الذين يتكلمون في اسماء الله وصفاته وكلامه وعلمه وقدرته، ولايسكتون عما سكت عنه الصحابة والتابعون لهم بأحسان)...

دووەمیان: (الحسن البصري)ە:-
کە لەنامەیەکی دا بۆ (عبدالملك بن مروان) یان بۆ (حجاج) دەنووسێت:
مەسەلەی قەزاو قەدەر شتێک نەبوو کە (صەحابە) باسیان کردبێت بەڵام کاتێک بینیمان کە کەسانێک هەن نکوڵی لیّ دەکەن، ناچار بووین کە ڕووبەڕوویان ببینەوەو ڕاکانیان پوچەڵ بکەینەوە].
مەسەلەی هەڵوێستی (سەلەف) لەزانستی (الكلام) هەمان هەڵوێستی پێشویان بووە، ئەوانەی کە (مناقشە)و ووتوێژیان دەربارەی (الشبهات) بەکارێکی باش نەزانیوە، ئەم زانستەشیان بەخراپ زانیوە، بەپێچەوانەوە ئەوانی تر بەزانستێکی باشیان زانیوەو، باشترین (تعریف)ی زانستی (کلام) ئەوەیە کە (ابن خلدون) لەپێشەکی یەکەیدا نوسیویەتی ودەڵێ (زانستێکە دەربارەی بەرگری کردن لەعەقیدەو ئیمان، بەبەڵگەی عەقڵی و ڕەت کردنەوەی ئەو لادەرانەی کە دەیانەوێت، لەکە لەمەزهەبی سەلەف و موسوڵمانان بگرن).
ئەگەر بەووردی سەرنجی ئەم (تعریف)ە بدەین، بۆمان دەردەکەوێت کە هیچ باسی ئەوە ناکات کە دەبێت لەگەڵ فەلسەفەو مەنتیقی یۆنانی دا تێکەڵ بکرێت، کەچی زۆر لەنەزانان ئێستا وای بۆ دەچن، کە ئەم زانستە تەنها لەفەلسەفەو مەنتیقەوە پەیدا دەبێت...
دوو هەڵوێستی جیاجیای (ابو حنیفەو شافعی) لەم بارەیەوە بەڵگەیە، کە تەنانەت زانایانی (سلف)یش باسیان کردووە. ماوەیەک بوو (ابو حنیفە) بەهیچ جۆرێک باس کردنی مەسەلە عەقائیدی یەکانی لەرێگەی زانستی (کلام)ەوە بەباش نەزانی، کەچی هەر ئەو زانایە کە لەسەردەمێکی تردا ڕووی تێدەکات و، تەنانەت کتێبی تێدا دادەنێت، وەک (الفقة الأكبر) هۆی ئەم گۆڕانەش دیارە گۆڕانی بارودۆخ و پێویستی خەڵکان بووە ...
هەروەها ئیمامی شافعی لەزۆر شوێن دا دژی زانستی (کلام) قسەی کردووەو بەکارێکی خراپی زانیوە ، کەچی هەر ئەم زاتە لەبەردەم ( الرشيد ) دا ، دەکەوێتە مناقەشەوە لەگەڵ

(بشیر المرسی )دا دەربارەی مەسەلەکانی ئەم زانستە، ( المزنی ) دەگێڕێتەوە :
(لەگەل پیاوێک دا کەوتنە گفتوگۆو، دەربارەی مەسەلەیەکی عەقائیدییەوە پرسیاری لی کردم و خەریک بوو بمخاتە گومانەوە، لەبەرئەوە چوومە خزمەت شافعی و بۆم گیرایەوە، ئەویش فەرمووی: ئەم مەسەلەیە هی بیدینەکانەو وەلامەکەشی بەو جۆرەیە).

لەمەسەلەی قورئانیش دا ئیمامی (احمد) پێی وابوو، قسەکردن دەربارەی ئەوەی کە جیاوازی هەیە لەنێوان ووشەو ماناو (قدیم و حادث) کارێکی بێ هودەیەو (صەحابە)کانیش هیچ کاتێک خۆیان بەو جۆرە مەسەلانەوە خەریک نەکردووەو، هەر ئەوەندە کە بروا بکرێت بەوەی، کە لەلایەن خواوە هاتووە، ئیتر شتی تر زیادەرەوی یەو هیچ پێویست ناکات، هەر لەم رێگەیەش دا بوو ئەو هەموو دەردەسەری و چەرمەسەری یەی بەسەرهات.

کەچی ئیمامی (شافعی) وای پێ باش بوو، کە دەبێت جیاوازی بکرێت لەنێوان مانا نەفسی یەکەو، ووشەو کاغەزو مەرەکەبەکەوە، کە یەکەمیان (قدیمە)و، ئەوانی تر تازە پەیدا بوون (حادث)ن، بەو شێوە خۆی لەو دەردەسەری یەی ئیمامی (احمد ) رزگار کرد، ئاشکرایە ئەم زاتەش هەمان رای شافعی بووە، بەلام لەرووی قەناعەتی زانستی یەوە، بەکارێکی ناڕەوای زانیوە، قسەیەک دەربارەی قورئان بکات، کە لەوەوپیش کەس ئەوەی نەکرد بیت...

## مەسەلەی پەنا بردن

مەسەلەی پەنا بردنە بەر پیغەمبەر ( ﷺ )یان هەرپیاو چاکێکی تر، ئەوەی کە گومانی تیا نی یە ئەوەیە، کە بەدرێژایی هەر سێ چەرخەکەی (سلف) کەس لەو بارەوە نەدواوە، ئەوەی کە لەحەدیسی (صحیح)ەوە وەرگیراوە ئەوەیە، کە(صەحابە) لەکاتی خۆی دا داوایان لی کردووە دوعایان بۆ بکات و، هەموو شتیکی ئەویان بەموبارەک و موتەفەرک زانیوە وەک: ئارەق، موو، ئاوی دەستنوێژو... ئەم حەدیسەش بەلگەیە لەسەر ئەوە: کە (عثمان بن حنیف) دەگیریتەوە: (ان رجلا ضریرا أتی النبي ( ﷺ ) فقال:ادع الله ان یعافیني قال: ان شئت دعوت وان شئت صبرت. فهو خیر لك. قال فادعه. قال فأمر ان یتوضا فیحسن وضوءه ویدعو بهذا الدعاء: اللهم إني أسئلك واتوجه الیك بنبیك محمد. نبي الرحمة اني توجهت بك إلی ربي في حاجتي هذه لتقضی لي . اللهم فشفعه في ) هەروەها ئیمامی (عمر ) لەکاتی

بێ بارانیدا پەنای بردۆتە بەرحەزرەتی (عەباس) مامی پیغەمبەر(ﷺ) یان ئەوەی کە لەساڵێکی گرانیدا لەسەردەمی حەزرەتی(عمر)دا پیاوێک دەچێتە سەر گۆڕی پێغەمبەر(ﷺ)و عەرزی دەکات : ئەی پیغەمبەری خوا داوای باران بۆ نەتەوەکەت بکە، وا خەریکە لەناو دەچن، لەخەودا پێی دەڵێت کە باران یان بۆ دەباریت.
حەدیس لەم بارەوە زۆرن، وەک ئەوەی کاتیک (فاطمة بنت أسد)ی دایکی (ئیمامی علی) وەفاتی کرد، کە کاتی خۆی بەخێوی کردبوو، بۆی پارایەوەو فەرمووی: (اللهم اغفر لأمي فاطمة بنت أسد ووسع عليها مدخلها بحق نبيك والأنبياء الذين من قبلي).

یان پارانەوەکەی حەزرەتی(ئادەم) (ﷺ)مان بۆ دەگێڕیتەوە کە (يارب أسئلك بحق محمد الا ماغفرت لي).

ئەوەی کە لە(صحابە)و (سلف)ەکانی ترەوە بۆمان ماوەتەوە، هەر ئەوانە بوون کە باسمان کردن، وە بەم شێوەیە مایەوە تاسەردەمی (ابن تیمیە) کە هات جیاوازی کرد لەنێوان پەنا بردن (التوسل) لەکاتی ژیانداو، پەنا بردن لەدوای مردن، کە یەکەمیانی بەڕەوا زانی و، دووەمیانی بە(حەرام).
ئێمە نازانین ئەم زانایە ئەم جیاوازی یەی لەکوێوە هێنا، وەک ووتمان ئەوەی کە لە(سەلەفە)وە بۆمان ماوەتەوە، ئەوانە بوون کە باسمان کرد، کە هیچیان باسی ئەم جیاوازی یە ناکەن، ئاشکراشە ئەو پەنا بردنە تەنها بۆ ئەوەیە کە ئەو زاتانە پلەو پایەیان لەلای خوا بەرزە، نەک لەبەر خودی خۆیان و توانای ماددییان، پاشان مەسەلەیەکی وا هی ئەوە نی یە موسوڵمانان بکاتە دوو کۆمەڵەو، دووبەرەکی بخاتە ناو ریزەکانیانەوە، بەڕای ئیمە (بدعە) لەوەدا نی یە کە یەکێک (توسل) بەپێغەمبەران یان پیاو چاکان بکات، بەڵکو لەوەدایە کە یەکێک پێی وابێت ئەو کارە دەرچوونە لەکرداری پێشینەکان و، لەکۆمەڵی موسوڵمانان دووری دەخاتەوەو، لەکوفرو گومرایی نزیکی دەخاتەوە، چونکە ئەم بۆچوونە هیچ بەڵگەی لەسەرنیە، مەسەلەی (عبادات)و گۆڕینی چەند شتێکی لاوەکی و زیاد کردنی چەند شتێکی تر، مەسەلەیەک نی یە کە داهێنانی تیا ئاشکرا بێت، چونکە دیسان ئەوەش دەکەوێتە بەر بازنەی (اجتهاد)ەوە، ڕای پێشینەکان دەربارەیان جیاواز بووەو، نمونەش لەو بارەیەوە زۆرن وەک :ـ

داهێنانی بانگێکی تر لەڕۆژانی هەینی دا، لەلایەن ئیمامی (عثمان)ەوە، کە دەبوو لەسەربانی ماڵەکەی لە(الزوراء) بدرایە، چونکە شاری (مەدینە) گەورە بوو بوو، دەنگی

بانگی مزگەوت نەئەگەیشتە دەوروبەری شارەکەی ، کە ئەمەش (اجتهاد)ی خۆی بوو ، وە کەسیش پێی نارازی نەبوو.

## مەسەلەی ئیحرام بەستن بەحەج و عەمرە

ئیمامی (عثمان) پێی وابوو:ـ لەپێش شوێنی تایبەتی خۆیدا، ئەگەر یەکێک ئیحرام ببەستێت، ئەوا کارێکی (بیدعە)ی کردووەو ، هیچ پاداشتی نی یە ، کەچی زۆربەی (صحابە) لەسەر ئەو رایەی ئەو نەبوون و پێچەوانەی بوون. لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ ئیحرام بەستنەکەی (عبدالله بن عامر) کرد ، کاتێک خوراسانی رزگار کرد ، لەسوپاسی ئەو سەرکەوتنەدا هەر لەشوێنی خۆیەوە لە (خراسان) ئیحرامی بەست و ، چوو بۆ عەمرە ، کەچی ئیمامی عثمان پێی فەرمو : (لقد غدرت بعمرتك حين احرمت من نيسابور).

ئیمامی (علی) پێی وابوو ، کە ئەگەر شاگردێک شتێکی لەناو برد ، پێویستە پێی ببژێرێت ، کەچی زۆربەی (صەحابە) لەگەڵیا نەبوون ، ئیمامی (علی) دەی فەرمو: باشترین رێگا بۆ پارێزگاری کردن لەبەرژەوەندی خەڵک ئەوەیە ، کە پێیان بژمێررێت ، ئەگینا یان ئەبێت شاگردی نەمێنێ ، کە ئەمەش کاری خەڵک پەک دەخات ، یان ئەبێ دەرگای دزی و درۆوو دەست بری بخرێتە سەر گازی پشت. کەواتە بەرژەوەندی لەوەدایە کە پێیان ببژمێررێت.

کەچی (صحابەو تابعین) لەسەر ئەو رایە نەبوون ، وە ئەیان فەرمو:ـ کە ئەمە لەسەردەمی پێغەمبەردا نەبووە...

ئەگەر بەدوای ئەم جۆرە مەسەلانەدا بگەرێین ، زۆر لەو بابەتانەمان بەرچاو دەکەوێت ، بەڵام هەرگیز کۆمەڵێکیان کۆمەڵەکەی تری بەگومرا نەداوەتە قەڵەم ، چونکە هەموویان لەژێر سێبەری پابەند بوون بەقورئان و حەدیس دا ئەو رایانەیان دەربریوە ، واتە پابەندی ئەو بەرنامە زانستی یە بوون کە بەدرێژی باسمان کرد...

# هەڵوێستەیەک لەگەڵ ( إبن تيميه ) دا

پێش ئەوەی باسی (البدعـه) کۆتایی پێ بـهێنین، دەربارەی دوو خاڵ لەهەڵوێستی (ابن تیمیه) دەدوێین، کە پێمان وایە ئەم زانایە لەوانەدا کەوتۆتە هەڵەوە، لەکاتێکدا کە بەدرێژی باس لە(علم الكلام) دەکات و دەگاتە ئەو ئەنجامە:ـ
کە خۆ خەریک کردن پێ یەوە (بدعه) نیەو ، حەرامیش نیە، ئەوەتا دەڵێت:
(ووتووێژ لەگەڵ ئەوانەدا بەزمانی خۆیان، کارێکی خراپ نی یە، لەکاتێکدا کە پێویستمان پێی بێت).
پاش ئەوە دەڵێت: [سەلەف هەر لەبەر ئەوە (کلام)یان بەباش نەزانیوە، چونکە هەندێک زاراوەی وەک (الجوهر- العرض- الجسم)ی تێدا بەکار هاتووە، بەڵکو لەبەر ئەوە بووە چونکە مانای ئەو ووشانە چەند شتێک دەگرێتەوە کە نەهی لێ کراوە. جا ئەگەر ئەو مانایانە بەشێوەیەک بن کە لەگەڵ قورئان و حەدیس دا دژ نەبن، ئەوە بەهەڵە دانانرێن ].
ئێمەیش دەڵێین:
هەر کەسێک خۆی بەم زانستەوە خەریک کردبێت ، هەروای ووتوەو ، کەسیش بڕوای بەشتە بێهودەکانیان نەبووە. ئەوەتا ئیمامی (غزالی) زۆر بەباشی زاراوەی (فەلسەفە)ی زانیوە، بەڵام ئەو بۆ دوو مەبەست بەکاری هێناون: یەکەم بۆ دەرخستنی ئەو هەقیقەتەی کە لەقورئان و حەدیس دا هاتووە.
دووەم: تا ڕا پوچەکانیان بۆ خەڵک ڕوون بکاتەوە، تا لێ یان دوور بکەونەوە... سەیر لەوەدایە کە (ابن تیمیه) لۆمەی غەزالی دەکات لەسەر ئەوەی کە خۆی بەو شتانەوە خەریک کردووە، کە دەبوو سوپاسی بکات، بەوەش خۆی بۆ خۆی دژایەتیەکی لەگەڵ هەڵوێستی پێشویدا دروست کردووە، تەنانەت ئەم دوو هەڵوێستە وای لەهەندێک لەخوێنەرانی کردووە، کە وابزانن کە ئەم زانایە دژی (علم الكلام) دواوە، لەگەڵ ئەوەشدا کە ڕاستی یەکەی وانی یە، بەڵکو لەبەرگی سێهەمی کتێبی (مجموع الفتاوى)دا زۆر بەدرێژی باسی ئەو مەسەلانەی کردووە، بەشێوەیەک، کە تەنانەت لەبەرنامەی قورئان و ڕوون کردنەوەی عەقائیدی ئیسلامی دوورکەوتۆتەوە..
لەوەش سەیرتر ئەوەیە، لەگەڵ ئەوەشدا خەڵکان لەگومڕایی (فەلسەفە) دەترسێنێ، کەچی خۆشی تووشی مەسەلەی وا کردووە، کەوا بەئاسانی نەیتوانیوە خۆی لێ یان ڕزگار بکات. ئێمە لێرەدا تەنها دوو مەسەلە باسی دەکەین :ـ یەکەم: دەربارەی ئەوەی کە (ابن حزم) لەکتێبی (مراتب الأجماع)دا دەڵێت : (هەموو موسوڵمانان یەک ڕان، لەسەر ئەوەی

خوای مەزن هیچ هاوبەشی نیەو ، دروستکەری هەموو شتێکەو هەر خۆی بووەو ، کەسی تری لەگەڵدا نەبووە ، پاشان هەموو شتەکانی دروست کردووە ).

(ابن تیمیە) دەڵێت: [ڕاستە هەموو زاناکان یەک ڕان لەسەر ئەوەی کە هەر خۆی هەموو شتێکی دروست کردووە ، بەڵام لەسەر ئەوە یەک ڕانین ، کە ئەگەر یەکێک بەپێچەوانەی ئەوەوە بێت ، کافر دەبێت. چونکە (القدریە) پێیان وایە ، کە کرداری ئاژەڵەکان خوا دروستی نەکردووە ، پاشان ئەوەش ساغ نەبۆتەوە ، کە پێش دروست کردنی ئاسمان و زەوی دروست کراوی تر نەبووە . . ].

بەمە دەیەویت ئەو قسەیەی فەلاسفە دووپات بکاتەوە کە دەڵێن: [شتەکان هەموویان تازە دروست کراو نین ، بەڵکو نەوعەکەیان هەر بووە واتە (قدیم) . ].

ئاشکرایە (ابن تیمیە) لێرەدا کەوتۆتە هەڵەیەکی سەیرەوە ، چونکە هەموو کەس ئەوە ئەزانێت ، کە نکولی لەئایەتی (الله خالق کل شئ) الرعد/١٦. الزمر/٦٢ هەر کەسێک بیکات پێی کافر دەبێت ، چونکە ئەم مەسەلانە پێیان دەوتریت [معلوم من الدین بالضرورة] ، پاشان تائێستا کەس نەیبیستوە کە (القدریە) قسەی وایان کردبێت ، کە کرداری ئاژەڵ دروستکراوی خوا نی یە . . .

پیاو نازانێ چۆن ئەم قسەیەی (ابن تیمیە) لێک بداتەوە ، ئاشکرایە کە لەم دوو تەفسیرە هیچی تر هەڵناگریت:.

١ . بێجگە لەخوای مەزن یەکێکی تر هەیە ، هەندێک لەشتەکانی ناو بوونەوەری دروستکردوە ، کەواتە دروستکردنی گشتی دەگەڕێتەوە بۆ هەردوو لایان.

٢ . بەشێک لەشتەکان دەستی دروستکردنی نەگەیشتوتێ بەڵکو هەروەک خوای مەزن قەدیمە.

جا ئایا چ موسوڵمانێ هەیە ئەوە نەزانێت ، کە هەردوو لێکدانەوەکە ئەوپەڕی شەریک بۆ خوا قەرار دانەو ، کوفری ئاشکران؟

ئەی هەموو دەقەکانی قورئان و حەدیس زۆر بەئاشکرا نکولی لەمە ناکەن؟.

ئەی ئەبێت کافر چی بێت؟

سەیر لەوەدایە ئەگەر کتێبی (الفتاوی)ی ابن تیمیە سەیر بکەین ، هەمووی باسی ئەوە ئەکات ، کە یەکێک ڕایەکی وای هەبێت (کافر) دەبێت .

بەکورتی ئێمە پیمان وایە ، کە (ابن تیمیە) تەنها هەر بۆ ئەوەی کە ڕاکەی (ابن حزم) ڕەت بکاتەوە ، ئەوەی نوسیوە ، ئەگینا ئەم جۆرە ڕایانە لەپیاوی زاناو بلیمەتی وەک ئەو دوورن .

دووەم: دەربارەی مەسەلەی هۆیەکان (الاسباب) : هەموو جەماوەری موسوڵمانان لەو

بروایەدان، کە خوای مەزن ئەنجامەکان لەکاتی پەیدا بوونی هۆیەکان دروست دەکات، بەڵام هۆیەکان دەوریان لەو ئەنجامەدا نی یە. فەیلەسوفە کۆنەکان پێیان وایە: کە هەموو شتێک لەئەنجامی سروشتەوە دروست دەبن، بەڵام فەیلەسوفە موسوڵمانەکان وەک (فارابی و ابن رشد) دەلین: بەهۆی ئەو هێزەوەیە کە خوا لەشتەکاندا دروستی دەکات، واتە بروایان بەوە هەیە کە شتەکان لەئەنجامی هۆکانەوە دروست دەبن.

(ابن تیمیە) دوای قسەی ئەم فەیلەسوفانە دەکەوێت و دەڵێت: [ هەر کەسێک پێی وابێت کە خوا شتەکان دروست دەکات، نەک هۆیەکان، بەپێچەوانەی قورئانەوە قسەی کردوە وە ئینکاری ئەو هێزە ئەکات کە خوا لەئاژەڵدا دروستی دەکات، تاکار بکات هەروەک توانای بەندە].

کەواتە ئاگر هێزیکی تیایە شت گەرم دەکات، چاو هێزی بینینی تیایەو، زمان هێزی چێژوو... هتد هەندێک نکولی لەهێزەکان و سروشت دەکەن وەک (ابی الحسن و پەیرەوانی لە هاورێکانی ئیمامی مالک،ئیمامی شافعی) هەروەها نکولی لەهۆیەکان دەکەن، واتە دەڵێن: خوا شتەکان دروست دەکات، نەک بەهۆی ئەو هێزەوە کە تیایدا هەیە، بۆ نمونە: دەڵێن خوا مرۆڤ بەهۆی نانەوە تێر ناکات و، بەهۆی ئاوەوە ئاواشتەی ناکات، بەڵکو خوا ئەو ئەنجامانە دروست دەکات، پاشان دەڵێت: ئەمانە پێچەوانەی قورئان و حەدیس و ئیجماعی موسوڵمانانن، چونکە کەس نی یە ئەوە نەزانێت کە هەندێک شت دەبنە هۆی شتی تر، دیارە کە تێری لەئەنجامی خواردنەوەیە، نەک ژمارە کردن و، بەخواردن دەبێت نەک بەبەرد..و ئاویش هۆی ژیانی ڕوەک و گیان لەبەرە، وەک دەفەرموێت: (وجعلنا من الماء كل شئ حي) الأنبياء/٣. وە گیان لەبەریش بەئاو خواردنەوە تێراو دەبیت، نەک بەرۆیشتن و... هتد].

بەم شیوەیە (ابن تیمیە) بەم قسەیەی قسەکەی (أرسطاطاليس) دوپات دەکاتەوە، کە پێی وایە، هەموو شتێک هۆی خۆی هەیەو، دەوریکی کاریگەر بۆ (مادە) بریار دەدات، بەوەش لەگیانی مەزەبی ئیسلامی دەردەچێت و، دەچێتە سەر بیری مەنتیقی (ئەرسطاطاليسی)) و، لەوەش سەیرتر ئەوەیە: پێی وایە کە ئەوە ڕای قورئانی پیرۆزە، بەبەڵگەی ئەوەی کە پیتی (ب) یا (ل) بەمانای (سببی) بەکار هاتووە، وەک لەئایەتی: (فأنبتنا به حدائق ذات بهجة) النحل/٦٠. (فأنزلنا به الماء) الأعراف/٥٧. (فأخرجنا به من كل الثمرات) الأعراف/٥٧. (ولتعلموا عدد السنين والحساب) الأسراء/١٢. (ولتبلغوا عليها حاجة) غافر/٨٠.

ئێمە پێمان وایە: ئەگەر (ابن تیمیە) ئەمانە بەهۆی (حەقیقی) بزانێت، ئەوە کوفرێکی ئاشکرایە، چونکە ئەگەر وابێت، ئەوە مانای وایە کە خوا توانای نی یە خۆی شتەکان ئەنجام بدات، بۆیە ناچارە ئاو بکات بە(واسطة) بۆ رووواندن و هەوریش بۆ باران بارین..

خۆ ئەگەر پێی وابێت ئەم جۆرە پێتانە بۆ (سببی جعلی)یە، واتە خوا کردویەتی بەعادەت کە باران بارین لەگەڵ هەوردا پەیدا دەبێت، ئەوە رای هەموو موسوڵمانانەو، لەگەڵ دەقەکانی قورئان و حەدیس دا یەک دەگرنەوە، بەلام وا دیارە (ابن تیمیە) ئەمو مەبەستەی نیە، چونکە دەورێکی کاریگەری بۆ هۆیەکان بڕیار داوە. پاشان ئەم قسەیەی لەگەڵ ئایەتی پیرۆزی (إن الله یمسك السموات والأرض أن تزولا)فاطر/٤١ وە ئایەتی (ومن أیاته أن تقوم السموات والأرض بأمره) الروم/ ٢٥. یەک ناگرنەوە. چونکە ئەم ئایەتانە ئەوە ئیسپات دەکەن، کە هەمیشە خوای مەزن سەرپەرشتی ئاسمان و زەوی دەکات نەک سروشت..



سێهەم :

## (تصوّف) و ئەو باس و گێروگرفتانەی کە رووی تێ دەکەن

ئەو ناوەش ناوێکی تازەیەو بۆ ناونراوێکی کۆن دانراوە (مسمیّ قدیم)، چونکە ئەم ناوە کراوەتە ناوی ئەو کەسانەی کە هەمیشە خەریکی پاککردنەوەی (نەفس)یانن، لەو چڵکانەی کە توشی دەبێت، وەک حەسودی و خۆ بەزل زانین و خۆشەویستی ژیانی دونیاو، بەیەکجارەکی ڕوو نەکەنە خواو، پشت بەو دەبەستن، چونکە ئاشکرایە مادام مرۆڤ خۆی پاک نەکاتەوە، ئەوا ئیسلامی یەتی یەکەی هەر بەناوەو هیچی تر، بەڵکو لەوانەیە زۆر لەکارەکانی ببنە هۆی زیاتر چڵکن بوونی نەفسی ، وەک خۆ بەزل زانین بەسەر خەڵکداو، هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی پارەو پول و، پەیدا کردنی پلەو پایە بەهۆی وەزیفەی ئیسلامەتیەوە .ئاشکرایە موسوڵمانییەتی ئەم جۆرە کەسانە، هەر توێکڵەو هیچی تر نیە، چونکە کاکڵەی ئیسلام بریتی یە لەپاکردنەوەی (نەفس)و ڕواندنی رەوشتە باشەکان، وەک خۆشەویستی و دڵسۆزی و ترسان لەخواو... ئەو (جیهاد)ەی کە چەند جارێک لەقورئاندا دووبارە بۆتەوە وەک لەئایەتی (وَجَاهَدُوا فِي اللهِ حَقَّ جِهَادِهِ) الحج/٧٨. هەر بەو مەبەستەیەو، بەخت کردنی گیان و سەروەت بەشێکە لەم جیهادە.

ئەو گوناهە نهێنی یەی کە خوا لەچەند شوێنێکدا نەهی لیّ دەکات، وەک لەئایەتی (وَذَرُوا ظَاهِرَ الأثْمِ وَبَاطِنَهُ) الأنعام/١٢٠، هەر ئەو کارە ناشیر ینانەن، کە پەردەی سەر دڵ دروست نەکەن، وە هەمیشە قورئان داوا دەکات کە خۆمان پاک بکەینەوە: (فَقُلْ هَلْ لَكَ إِلىٰ أَنْ تَزَكَّى وَأَهْدِيَكَ إِلىٰ رَبِّكَ فَتَخْشَى) النازعات/١٨-١٩. تەنانەت ئەو (احسان)ەی کە لەوەو پێش باسمان کرد، هەر لەئەنجامی ئەو خۆ پاک کردنەوەوە دەست دەکەوێت (وهو ان تعبد الله كأنك تراه فان لم تكن تراه فانه يراك) ئەوانەی سەرەوە کاکڵەی ئیسلامن و، هیچ کەس گومانی نیە لەوەداو، پێشینەکانیش هەر لەسەر ئەو ڕێ یە بوون، جا ئەم کارە هەر ناوێکی لیّ بنێیت گرنگ نی یە. گرنگ ئەوەیە ئەو کارانە نیشانەی موسوڵمانی ڕاستەقینەن.

ئاشکراشە هەوڵدان بۆ پاک کردنەوەی (نەفس)ی مرۆڤ، ئەگەر پابەندی ئەو (شەریعە) ئیسلامی یە بێت، کە لەقورئان و حەدیسەوە بێت کارێکی زۆر باش و، پاداشتێکی زۆری هەیە، بەپێچەوانەوە ئەگەر لەگەڵ ئەحکامی (شەریعەت دا یەک نەگرێتەوە، ئەوا کارێکی خراپەو نەهی لیّ کراوە، وەک لەپێشەوە ئاماژەمان بۆ کرد.. ئەوەندە هەیە، جاری وا هەیە لەم پاککردنەوەدا چەند کردەوەو کارێکی پەروەردەیی پەیرەو دەکرێن، کە بەتەواوی ساغ نەبۆتەوە داخوا لەگەڵ ئەحکامی شەرع دا یەک دەگرنەوە یان نا ؟ هەروەها ئەوەش ساغ

نەبۆتەوە کە دژ بەو بنەماو نەحکامە شەرعیانەن یان نا .... ، لەبەر ئەوە ئەم کردەوانە دەکەونە بەر (اجتهاد)و کەس ناتوانێت بڵێت ئەمانە دەبنە هۆی گومرایی و لەرێ لادان. ئەم کردەوانەش چەند جۆرێکن، ئێمە لێرەدا چەند نمونەیەکیان دەخەینە بەرچاو، کە گێرمەو کێشەی زۆریان لەسەر پەیدا بووە:-

* یەکێک لەوانە بەستنی کۆڕی زیکرە، لەچەند کاتێکی دیاری کراوو بەجۆریکی تایبەتی: ئەوانەی خۆیان بە(سەلەفی) دەزانن، ئەم کارەیان بەلاوە باش نی یەو، ئەو کەسانەش کە ئەیکەن بەگومرایان دەدەنە قەڵەم، بەبەڵگەی ئەوەی کە ئەم کردەوەیە لەچەرخی سەلەفدا نەبووەو لەقورئان و حەدسیش دا باس نەکراوە.

ئەوانەش کە بەوکردەوەیە هەڵئەستن، بەڵگەیان ئەو ئایەتەیە کە دەفەرمویت: (الذین یذکرون الله قیاما وقعودا وعلى جنوبهم) ال عمران/١٩٢. ئاشکرایە ئەم ئایەتە گشتی یەو، هیچ جۆریکی لی بەدەر نیە، مەگەر ئەوەی کە کردەوەیەکی خراپی لەگەڵدا بێ، وەک سەما کردن و خۆ بادانی لەگەڵدا بێت، جا ئەگەر یەکێک بەتەنها، یان لەگەڵ چەند کەسانێکی تردا، خەریکی زیکری خوا بێت و، هیچ کردەوەیەکی حەرامی لەگەڵدا نەکات، ئەوە ئاشکرایە کە کارێکی ڕەوایەو، بەهیچ جۆریک لەدەقە قورئانی یەکە دەرنەچووە.

هەروەها بەڵگە بەم حەدیسانەش دەهێننەوە (لایقعد قوم یذکرون الله. الا حفتهم الملائکة وغشیتهم الرحمة. ونزلت علیهم السکینة. وذکرهم الله فیمن عنده) یان فەرموودەی (ان لله ملائکة سیارة فضلاء. یتبعون مجالس الذکر) ئاشکراشە کە ئەڵقەی زیکر، دەبێت بەشێوەیەکی تایبەتی و، لەکاتێکی دیار کراودا بێت، کەواتە خۆ بەستنەوە بەوەی کە لەکات و شوێنی دیاری کراودا (بیدعه)یەو نابێت بکرێت، هیچ بنەمایەکی ڕاستی نیە، کەواتە مەسەلەکە (اجتهاد)یە، وە هەردوو ڕاو بۆچوونەکە دەکەونە ژێر ئەو بەرنامە زانستی یەی کە باسمان کرد، کەواتە سوور بوون لەسەر ڕایەک و گومرا کردنی لاکەی تر، دوورە لەکاکڵەی ئاینێ و بیجگە لەخۆپەرستنی چی تر نی یە...

* یەکێکی تر لەو کارانە، هینانی ناوی خوا (اللـه)یە بەتەنها، بێ ئەوەی بخرێتە ناو ڕستەیەکی تەواوەوە: (سەلەفی)یەکان نکولی لەمەش دەکەن و، بەکارێکی خراپی دەزانن و ئەو کەسانە بەگومرا دەدەنە قەڵەم ،وەک (ابن تیمیه) کە پێیان دەڵێت گومرا. بەڵگەشیان لەسەر ئەم ڕاو بۆچوونەیان ئەوەیە، کە هەموو شێوەکانی زیکر لەقورئاندا ڕستەی تەواون و مانای تەواویان هەیە، وەک: لا الـه الا الله. استغفر الله. سبحان الله .لاحول ولا قوة إلا بالله ، کەواتە ناو هێنانی خوا بە ووشەیەکی تاک ( بیدعه ) یەکی

خراپە، (ابن تیمیە) دەڵێت لەوانەیە ئەو کەسە لەئەنجام دا بخاتە گومانی (وحدة الوجود)ەوە.
بەڵام زۆربەی موسوڵمانان هیچ خراپی یەک لەمەدا بەدی ناکەن و، پێیان وایە هیچ جیاوازی یەک لەوەدا نی یە، کە بەتاک یان لەناو ڕستەدا ناوی خوا بهێنرێت.. بەڵگەشیان ئەم ئایەتانەیە:-
(وَاذْكُر اِسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلاً) الدهر/٢٥ ئاشکرایە یەکەم ناوی خوا (الله)یە.
(وَاذْكُرْ رَبَّكَ فِي نَفْسِكَ تَضَرُّعاً وَخِيفَةً، وَدُونَ الْجَهْرِ مِنَ الْقَوْلِ، بِالْغُدُوِّ وَالأَصَالْ. وَلاتَكُنْ مِنَ الغَافِلِينْ) الأعراف/٢٠٥.
هێنانی ناوی خوا، مەرج نی یە کە دەبێت لەڕستەی تەواودا بێت. ئەوەش کە (ابن تیمیە) دەڵێت: گومانی (وحدة الوجود)ی لێ دەکرێت ڕەت دەکەنەوە، بەوەی کە ئەو کەسەی زیکری خوا دەکات، هەرگیز بیر لەخۆی ناکاتەوە، بێجگە لەخوای مەزن شتێکی تری بەخەیاڵدا نایەت.
لێرەش دا ئێمە نامانەوێت ڕایەک بەسەر ڕایەکی تردا زاڵ بکەین، چونکە هەردوو بۆچوونەکە لەبازنەی پابەند بوون بەقورئان و حەدیس دەرنەچوون، بەڵام ئەوەی لەو بازنە ڕەها دەبێت، ئەو کەسەیە کە ڕاو بۆچوونەکەی خۆی بەراست بزانێ و خەڵکی تر بەگومڕا، ئەگینا چۆن دەکرێت پیاو بەو کەسەی کە بەم ئایەتە پشت دەبەستێت (وَاذْكُر اِسْمَ رَبِّكَ بُكْرَةً وَأَصِيلاً) بڵێ لەڕێی ڕاست لای داوە؟ باشتر وایە هەردوو لایەنەکە بکەونە قسەو ووتووێژ لەو بارەیەوە، جا ئەگەر هەردووی گەیشتنە ڕایەکی یەک بوو، ئەوا باشە، ئەگینا پێویستە هەر لایەنێک ڕێز لەلایەنەکەی تر بگرێت، چونکە بەرنامەی زانستی وا دەخوازێ، وە بنەماکانی (اجتهاد)و شی کردنەوەی دەقەکان وا داوا دەکات.
بەڵام ئەوەی دووبەرەکی لەنێوان موسوڵمانان دا، وە خۆشکردنی ئاگری ناتەبایی و ڕقەبەرایەتی، وە دوژمنایەتی، کارێکە کە دژ بەئایینەو، بەڵکو یەکێک لە وەزیفە هەرە بەرزەکانی ئیسلام، نەهێشتنی ئەو دیاردە ناشیرینانەیە..
* یەکێکی تر لەو کارانە، ئەو زاراوانەی کە زانایانی (تصوف) دایان هێناون وەک (الوقت. المقام. الحال. الشریعة. الحقیقة. الطریقة). هەندێک پێیان وایە، کە ئەمانە داهێنراوی تازەن و زیادەڕەوین، سەر باری ئەو ئایینەی کە خوا لە ئایەتی (الْيَوْمَ اَكْمَلْتُ

لَكُمْ دِينَكُمْ وَأتْمَمْتُ عَلَيْكُمْ نِعْمَتِي وَرَضِيتُ لَكُمُ الأسْلامَ دِيْنَاً) المائدة/٣.
باسی تەواو بوون و کۆتایی هاتنی بنەماکانی دەکات، بەشێک لەزانایانی حەدیسیش ئەم جۆرە زاراوانەیان بەباش نەزانیوە..
(الخطيب البغدادي) لە(سعيد بن عمر البزدعى) دەگێڕێتەوە دەفەرموێت : لەمەجلیسی (أبازرعە)دا دانیشتبوم دەربارەی (الحارث المحاسبي)وە کتێبەکانیەوە پرسیاریان لیّ کرد، ئەویش فەرموی: واز لەو کتێبانە بێنە، خەریکی حەدیس بە، چونکە کتێبەکانی حەدیس هەموو شتێکی پێویستیان تیایە.
هەروەها ئیمامی(احمد)یش هەرچەند زۆر ڕێزی لە(المحاسبى) دەگرت، بەڵام حەزی نەدەکرد خەڵکی شتی لێوە فێر بن.
بەڵام زۆر لەزانایانی سەلەف، ئەم زاراوانەیان بەکارهێناوە: وەک: (سهل التستَرّي. العبيد البغدادي. معروف الكرخي و.... هتد) کورتەی راکانیشیان ئەوەبوو، کە ئەوە ڕوون کردنەوەی ئەوەیە، کە قورئان بەکورتی باسی کردووە. زانستی شەرعی یەکان هەمووی بریتین لەوەی، کە ئەو شتانەی قورئان و حەدیس بەکورتی باسی کردوون، زاناکان بەدرێژی لیّ یان دوواون، کەسیش نەی وتوە ئەوە (بدعە)یەو حەرامە، پێغەمبەر( ﷺ ) ئەفەرموێت:.
(انما انا بشر. وانه يأتيني الخصم. فلعل بعضهم ابلغ من بعض. فأحسب انه صادق. فأقضي له فمن قضيت له بحق مسلم. فانما هي قطعة من النار. فليحملها أو يذرها)
ئەگەر بەووردی سەرنجی ئەم حەدیسە بدەین، بۆمان دەردەکەوێت کە خەڵکان لێپرسراون بەرامبەر بەڵگەی ڕواڵەتی و، کەس بۆی نیە بچێتە ناو نهێنی خەڵکانی ترەوە، بەڵام ئەمە مانای ئەوە نیە، کە پیاو، نابێت بەدوای (حەقیقەت)دا بگەرێ. بەڵکە زۆر پێویستە کە مرۆڤ بەپێی ئەو ڕاستی یەی کە خۆی دەیزانێت کردار بکات، نەک بەشتە ڕۆاڵەتی یەکان.
ئەم حەدیسەش ئاگادارمان دەکاتەوە، کە لەئاین دا دوو جۆرە ئەحکام هەن، ئەوانەی کە بەتەرازوی دونیایی دەکێشرێن، ئەوانەش کە لەژێر چاودێری خوایی دان لەقیامەتدا.
جا تۆ دەتوانیت، ئەوانەی یەکەم ناو بنێیت (الأحكام القضائية) وە ئەوانەی دووەمیش (أحكام الديانە) يان (الشريعە والحقيقە).. کەواتە هەرچەند زاراوەکان زۆرو هەمە جۆرە بن، ئەوا ئەوەی پێویستە بیری لیّ بکرێتەوە، ئەوەیە ئاخۆ چەندیان دەچنە ژێر مانای قورئان و حەدیسەوە؟ ئەگەر وابوو، ئەوا دەبنە بەشێک لەئایین، خۆ ئەگەر واش نەبوونەوە

ئاشکرایە کە بە(بدعە) دادەنرێن و دەبێت خۆمانی لێ دوور بخەینەوە، رەنگە بەشێک لەزاناکان لەدیدو بۆچوونیکی ترەوە سەیری مەسەلەکە بکەن و بڵێن: بەکارهێنانی ئەم زاراوەو شتە تازانە لەوانەیە ببێتە هۆی یاری کردن بەجەوهەری ئیسلام و ئەحکامەکانی و، بنەماکانی، کەواتە باشتر وایە بەکار نەهێنرین.

بەلام ئایا ئەمە دەبێتە هۆی ئەوەی کە هەر کۆمەڵەو بۆ خۆی گروپێک پێک بهێنیت و، ناوێکی تایبەتی لێ بنێت و موسوڵمانان پارچە پارچە بکەن؟ ئایا سەلەفەکان ئەوەیان کردوە؟ ئەگەر وای دابنێین کە ئەوان ئەو کارەیان کردوە، تۆ بەچ بەڵگەیەک لایەنێکیان بەراست و، ئەوی تریان بەگومڕا دەزانیت، لەکاتێکدا کە هەردوو لایەنەکە سەلەف بوون؟؟ ئەگەر پێوەر (مقیاس) لای ئەوان بەرنامە زانستی یەکەیە، کە ئاواتی ئێمەیەو، ئەم کتێبە لەپێناو پێویستی ئەودا دانراوە. ئەی بۆچی ووشەی (سلف) دەکەنە ئەساس و واز لەبەرنامەکە دێنن؟

زانایانی (سەلەف) بۆ خۆیان هەمیشە لەسەر بنەمای بەرنامە زانستی یەکە بوون، هەر شتێک بەپێی ئەو بەرنامەیە لەگەڵ دەقەکاندا گونجا بێت، هەموویان پێی رازی بوون و، هەر شتێکیش وا نەبوبێت، بیری جیاجیان لەدەربارەیەوە بووە، زۆر جاریش بەپێی بارودۆخ راکانیان گۆریوە. بۆ نموونە: زۆر لەوانەی کە لەسەرەتاوە دژی (علم الکلام) بوون، کەچی پاش ماوەیەک لەراکەیان پاشگەز بوونەوەو، بەشتێکی باشیان داوەتە قەڵەم.

* یەکێکی تر لەو شتانە: ئەو حاڵەت و هەستە ویژدانیەیە، کە پێی دەڵێن: لەناوچوون (الفناء)، کە جاری وا هەیە وا لەهەندێکیان دەکات، کە قسەی وا بکات کە بەرواڵەت دژی بنەماکانی عەقیدەو شەرع بیت، ئەوەش دەبێتە هۆی هەڵچوونی هەندێک، کە نکوڵی لەو شتە دەکەن و بە(زندیق)یان ناو دەبەن. تەنانەت ئەو قسەیەی (رابعة العدویة)ش، لەو جۆرانە دادەنێن، کە دەڵێت: (اللهم اني ماعبدتك خوفا من نارك. ولاطمعا في جنتك ولكن وجدتك ربا تستحق العبادة فعبدتك).

ئەم گێرمەو کێشەیە شتێکی تازەیەو بەرای ئێمە لەناو زانایانی سێ چەرخەکەی (سلف)دا ئەو شتە نەبووەو، کەس لەوانەوە شتی وای نەگێراوەتەوە وەک ئەوەی (أبي يزيد البسطامي) ووتویەتی: (سبحاني -مافي الجبة غير الله- أنا الحق....) باشترین لێکدانەوە کە لەسەر مانای (الفناء) کرابێت، ئەو نوسینەیە کە (ابن تيميه) لەکتێبی (مجموع الفتاوى)دا نوسیویەتی، کە ئێمە لێرەدا بەکورتی دەی نوسینەوە:-

زاراوەی (الفناء) کە لەووتەی سۆفیەکاندا بەدی دەکرێت، بەسێ شت لێک دەدرێتەوە:

یەکەم: لەناو چوونی دڵ لەویستی غەیری خواو، پشت بەستن بەوو، پەرستنی. کە ئەمە یەکتاپەرستی و دڵسۆزی دەگرێتەوەو، لەراستی دا پەرستنی دڵەو رووکردنە خوای بێ هاوتایە، کە بەمە دەوترێت دڵی بێ خەوش (القلب السليم) وەک لەئایەت داهەیە،(إلا من اتى الله بقلب سليم) الشعراء/ ٨٩ واتە: هیچ جۆرە عەقیدەیەکی خراپ، ویستیکی نارەوای تیادا نامێنیت و، بەتەواوی واز لەویستی هەموو کەسێک دێنیت و، تەنها روو دەکاتە خوای خۆی، کە ئەمەش مانای (لا اله الا الله)یە، پێغەمبەر ( ﷺ )دەفەرمووێ: (لا الە الا الله ولانعبد الا اياه. وله النعمة وله الفضل. وله الثناء الحسن) بەکورتی ئەمە سەرەتای ئاین و کۆتایی یەکەیەتی.

دووەم: لەناوچوونی دڵ لەبینینی غەیری خوا: ئەوەی پیشوو نەمانی ویستی غەیری خوا بوو، ئەمەیان نەمانی بینینی غەیری خوایە، ئەوەیان وازهینان بوو لەپەرستنی غەیری خواو پشت پێ بەستنی ئەوبوو. ئەمەیان وازهینانە لەهەست پێ کردنی غەیری خواو، سەیر کردنیەتی، ئەمەیان کەم و کوری تیایە. چونکە بینینی راستیەکان وەک خۆی، کە بریتی یە لەحازرو زانینی خوا لەهەموو بوارێکدا،تەواوترە لەحازر بوونی بەتەنها. هەموو زاناکان یەک ران لەسەر ئەوەی، کە حاڵەتی (بقاء) واتە لەناو نەچوون لە لەناوچوون باشترە، کە ئەوەش هەست پێ کردنی هەموو شتەکانە بەحزوری خوا، وەک لەحەدیسی قودسی دا هاتووە (لايزال عبدي يتقرب الي بالنوافل. حتى أحبه. فاذا احببته. كنت سمعه الذي يسمع به. وبصره الذي يبصر به. ويده التي يبطش بها. ورجله التي يمشي بها. ولئن سألني لأعطيته. ولئن استعاذني لأعيذنه. فبي يسمع. وبي يبصر. وبي يبطش ويمشي ].

سێیەم: لەناوچوون لەوجودی غەیری خوا: واتە خوا خۆی وجودەو، هیچ شتێکی تر بێجگە لەو وجودی نیە، نە بەهۆی ئەوەوە، نە بەهۆی غەیری ئەوەوە، ئەمە رای ئەو کەسانەیە کە پێیان وایە (حەقیقەت) لەگەڵ شتەکاندا هەریەکەو، هیچ شتێکی تر بوونی بۆ نیە، وەک (البلياني، التلمساني، القرنوي)، ئەمان مەبەستیان ئەوەیە، کە خواو شتەکان دەبنە یەک و یەک دەگرنەوە، کە ئاشکرایە ئەمە کوفرو گومراییەو بەهیچ شێوەیەک لەگەڵ ئاینی ئیسلام دا یەک ناگرنەوە، خۆ ئەگەر مەبەستیان ئەوە بوایە، کە هەموو شتەکان بەهۆی خواوە دێنە وجودەوە، ئەوە باش بوو، وەک ئەوەی کە پیغەمبەر ( ﷺ ) فەرمویەتی: (اصدق كلمة قالها الشاعر كلمة لبيد: الا كل شئ ماخلا الله باطل) یان لەئایەتی: (كل شئ هالك الا وجهه) القصص/٨٨..

بەڕای ئێمە هۆی ئەم گرفتە دەگەرێتەوە بۆ دوو شت : -
یەکەم: دیاری نەکردنی سنووری ئەم مەسەلەیە.
دووەم: نەزانینی ئەو حالەتەی کە خاوەنی ئەم هەستەی پیا تێ ئەپەرێت.
مەبەستمان لەیەکەم ئەوەیە کە (الفناء) لای هەندێک لەگەل (الحلول)دا تێکەل دەبن و، وا دەزانێ کە یەک شت دەگرنەوە.
عەقیدەی (حلول) ڕای ئەو فەیلەسوفانەیە، کە پێیان وایە دیاردەی بونەوەر (الظاهر الکونیه) بەگشتی (تەعبیر) لەبوونە گشتی یە تەواوەکە دەکات، کە ئەویش بوونی خوای مەزنە، بەلام لەو عەقیدەدا هیچ بەلای دروستکەرەکەدا ناچن، بەلکو بەڕای ئەوان بێجگە لەدروستکراوەکان، هیچ شتێکی تر وجودی نی یە، ئەمە سەر لێشیوانیکی عەقلی یەو هەر لەکۆنەوە تووشی فەیلەسوفەکان بووەو، هەندێک لەفەیلەسوفەکانی ئیسلامیشی گرتۆتەوە. دوا کەسیش کە بروایان بەبونی خوا هەیە، نەک بێ دینەکان کە بەخۆیان دەلێن وجودی یە ئازادەکان (الوجودیون الأحرار). (سیرن کیرکجورد)ی فەیلەسوفی دانیمارکی بەسەرکردەی ئەم تیرەیە دادەنرێت.
بەلام (الفناء) زۆر جیاوازی لەگەل (الحلول)دا هەیە، ئەمە حالەتیکە تووشی کەسانێک دەبێت، کە بەتەواوی بونەوەریان لەبیر دەچێتەوەو، تەنها دروستکەریان لەبیرە، هەر بۆیەشە پەیوەندی یان لەگەل خەلکدا دەپچرێت و، لەژیانی ڕۆژانەیاندا لەسەر بەرنامەیەکی ڕێک و پێک نارۆن وەک: (شیخ احمد البدوی ٥٩٦-٦٧٥هـ) کە بەدرێژایی ژیانی لەو حالەتەدا بووە، هەندێکیشیان ماوەیەک لەو حالەتەدا بوون، پاشان گەڕاونەتەوە سەر حالەتی سروشتی، وەک لەسەرەوە ووتمان، لای هەندێک هەردوو حالەتەکە واتە (فناء وحلول) بەیەک چاو سەیر دەکرێن و، قسەکانی (البسطامي) بە(حلول) لێک دەدەنەوە، بەلام ئەگەر بەووردی سەرنجی مەسەلەکە بدەن و، لەژیانی ئەو زانایانە ئاگاداربن، ئەوا ئەو تۆمەتانەیان نەدەخستە پال ئەو زاتانە، چونکە ئاشکرایە هەموو موسولمانیک کە بەتەواوی بڕوای بەخوا هەبێت، بەشێکی لەم (الفناء) هەیە، واتە بڕوای بەوە هەیە، کە بێجگە لەخوا، هەموو شتێک لەحالەتی (فناء) دایە، هەموو سوودو زیانێک هەر لەخواوەیەو، پشت هەر بەو دەبەسترێ و، هەموو کارێک دەبێت بەئارەزوو ویستی ئەو بێت، کە بەمە دەوترێت (الفناء الأرادي) هەندێک لەو موسولمانانە پاش ئەم حالەتە، حالەتێکی تریان بۆ پەیدا دەبێت، کە لەهەموو شتێک دا صیفاتی خوای تیا بەدی دەکەن، تادەگەنە پلە یەک، کە پێی دەوترێت (الفناء الشعوری)، هەیانە لەسەر ئەم حالەتە بەردەوام بووەو، هەشیانە پاش ماوەیەک گەڕاوەنەتەوە سەر حالەتی ئاسایی .. ماوەتەوە

باس لەو قسەیەی (رابعة العدوية) بکەین:. کە فەرمویەتی: (اللهم ماعبدتك خوفا من نارك ولا طعما في جنتك و.... الخ) کە لەپیشەوە ئاماژەمان بۆ کرد. کە زۆر کەس نکولی لی دەکەن و بەشتیکی خراپی دادەنین، وە لەو جۆرە قسانەی لەقەڵەم دەدەن، کە لەئاینی دا نابیت شتی وا بوترێت.

منیش دەڵێم: بەراستی پاش تاووتوێ کردنی ئەم ووتەیە، من هیچ خراپی یەکی تیا بەدی ناکەم، بەڵکو جێی سەرسورمانە، ئەگەر کەسێک پێی وابێت کە ئەمە (بیدعەیەکی خراپە)، بەرای من ئەمە بێجگە لەپەرستن و یەکتابوونی خوای مەزن، هیچ مانایەکی تر نابەخشێت.

ئەگەر ئەمە بەدژی شەرعی دابنێین، کەواتە ئەبێت پێچەوانەکەی، واتە ئەوەی بوترێت: (اللهم اني ماعبدتك لأنك رب تستحق العبادة. ولكني عبدتك طمعا في جنتك وخوفا من نارك) موافقی شەرع بیت و، ووتەیەکی راست بێت، ئاشکرایە هیچ موسوڵمانیک شتی وەها نالێت، تەنانەت کەم کەسیش جورئەتی ئەوە دەکات کە قسەی وا بکات، دەبێ ئەو خواپەرستی یەی کە لەترسانا بێت و، بەتەماعی پاداشت بێت، چ جۆرە خواپەرستی یەک بێت؟ ئەی خۆ پیغەمبەری مەزن( ﷺ ) لەلایەن خواوە پێی راگەیەنرا، کە لە هەموو تاوانێکی رابردووی وە رانەبردووی بەخشراوەو، خوا هەموو شتێکی پێ دەبەخشێت، کەچی زیاتر خواپەرستی دەکردو خۆی ماندوو دەکرد، کاتێک لێیان پرسی، پاش ئەوەی بینیان قاچەکانی لەبەرمانەوەی زۆری لە نوێژدا زۆر ئاوسان – ئەی خوا لە هەموو گوناهێکت خۆش نەبووە، ئیتر بۆچی وا لەخۆت دەکەی؟ لەوەڵام دا فەرمووی: ئەی نابێت بەندەیەکی سوپاس گوزاربم؟

کە ئەمە ئاشکراترین بەڵگەیە، کە پەرستنی خوا بۆ پاداشت و بەهەشت نی یە، بەڵکو شوکرانەی ئەو هەموو نیعمەتە زۆرانەیە، کە خوا بەبەندەی خۆی بەخشیوە.

لەحەدیسیکی ( معاذ )دا هاتووە کە:[ ان النبي قال لە: يامعاذ اتدري ماحق الله على العباد؟ قال: الله ورسوله أعلم. قال: أن يعبد الله ولايشرك به شئ. قال: اتدري ماحقهم عليه اذا فعلوا ذلك؟ قال: الله ورسوله اعلم. قال: ان لايعذبهم].

بەئاشکرا روونی کردۆتەوە، کە پەرستنی خوا مافێکی خوایە لەسەر بەندەی خۆی، بەسیفەتی بەندایەتی، نەک لەشێوەی (عقد) بەستن دا، واتە: عیبادەت بەرامبەر پاداشتی نیە، وەک کرێ گرتەی ناو خەڵک، مەبەستی پێغەمبەریش لە (حق العباد) ئەوە نیە، کە

ئەمە ئەرکی سەر شانی خوایە، بەڵکو ئەمە چاکە کردن و بەزەیی پیا هاتنەوەیەو هیچی تر ... لەم حەدیسەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێت، کە نابێت ئەم دوو (حقیقەتە) تێکەڵ بەیەکتر بکرین، بەلاّم یەکەم: دەبێت وابزانریت کە حەقیکی خوای لەئەستۆ دایە بەسیفەتی بەندایەتی. دووەم: کە خوای مەزن هەمیشە رێز لەو جۆرە بەندانە دەگرێت و، دەیان خاتە بەر کەرەم و گەورەیی خۆیەوە.

هەمیشە قورئان ئاماژە بۆ ئەو حەقیقەتە دەکات و، ئەوە دووپات دەکاتەوە، کە پەرستنی بەندە تەنها لەبەر خوایەتی خوایە وەک دەفەرموێت: (وأنا ربكم فاعبدون) الأنبياء/٩٢. (إنني انا الله لا إله إلا أنا فاعبدني وأقم الصلاة لذكري) طه/١٤.

ئینجا با بگەڕێینەوە سەر ووتەکەی (رابعه) ئێستا بۆت دەرکەوت، کە ئەم قسەیە بێجگە لەوەلاّم دانەوەی خوای مەزن و، مل کەچ کردن بۆ مافی پەرستن هیچی تر نیە، بۆیە شتێکی سەیرە ئەگەر یەکێک نکوڵی لیٚ بکات.

خۆ ئەگەر یەکێک وا تیٚ بگات، مەبەست لەم ووتەیە ئەوەیە: ئەو بەندەیە بەهەشتی ناویٚ و ترسیشی لەدۆزەخ نیەو نایەوێت، خۆیی لیٚ بپارێزیت، ئەوا دیارە ئەو کەسە بەهەڵەدا چووە. چونکە ئەو ووتەیە هەرگیز ئەوە ناگریتەوە، دیارە ئەو دوانە دوو شتی سەربەخۆن:

یەکەمیان: پێویست بوونی هەستان بەئەرک بەرامبەر خوا، بەبیٚ ئەوەی چاوەڕێی پاداشت بکەین، وەک لەئایەتی (وماأمروا الا ليعبدوا الله مخلصين له الدين) البينة/٥.

دووەمیان: پێویستی چاو برینە کەرەمی خواو ترسان لەسزاکانی، بەڵکو یەکێک لەماناکانی پەرستن ئەوەیە، کە دەستی نزاو پارانەوە بۆ خوای خۆت بەرز بکەیتەوەو، داوای کەرەم و بەخششی بکەیت و، خۆت لەغەزەب و سزای بپارێزیت. وەک پارانەوەی پیغەمبەر ( ﷺ ) (اللهم إني أسألك الجنة وماقرب اليها من قول أو عقل. وأعوذ بك من النار وماقرب اليها من قول أو عمل).

جا ئەگەر یەکێک هەبێت بلیٚ: من بەهەشتم ناوێت و ترسیشم لەئاگر نیە، ئەوە مانای وایە خۆی بەدەستی خۆی خۆی دەخاتە گێژاوی سەرلێشیوانەوەو، ئاگای لەبیٚ دەسەلاّتی و ناتوانایی خۆی نیە. پارانەوەی ڕاست ئەوەیە: لەکاتێکدا کە دەستی نزا بۆ دەرگای پەروەردگار بەرز دەکەینەوەو، داوای بەهەشتی لی دەکەین و دەپارێینەوە کە لەسزای خۆی مانپارێزیت، دەبێت چاوەڕوانی ئەوە بین، کە خوا بەمەرحەمەتی خۆی، هەلس و کەوتمان لەگەڵ بکات، نەک بەو شیوەی کە ئیمە هەلی دەگرین، کە ئەویش سزاو ئازاردانە. چونکە پیغەمبەر ( ﷺ ) فەرمویەتی: (لن يدخل أحدكم عمله الجنة. ولا أنا. إلا أن يتغمدني الله

برَحْمَتِهِ). پێش کۆتـایی هـاتنی ئـەم بەشـەی کتێبەکـەمان، پێویسـتە ئـەم (حەقیقـە)تانـەی خوارەوە دەست نیشان بکەین :.

١.... ئەوانـەی کـە ڕێگـای ڕاسـتیان گرتـووە، چ لـەرووی عـەقیدەوە، چ لـەرووی هـەڵس و کەوتی ڕۆژانەوە، تەنها لەبەر ڕۆشنایی دوو شتەوە ئەوەیان دەستگیر بووە: یەکەم: پابەند بوون بەقورئان و حەدیس. دووەم: خۆ بەستنەوە بەبەرنامە زانستی یەکەوە، لە تێگەیشـتنی دەقەکانی و لێکدانـەوەیان، کـە بەراسـتی ئەمانـەن حـەقی خۆیـەتی پێیـان بوترێت (ئـەهلی سوننەت و جەماعەت ).

٢.... ئەوانـەش کـە لـەرێی ڕاست لایانداوەو، کەوتونەتـە گێـژاوی سەرلێشـێوانەوە، هـەر لەبەرئەوە بووە کە پشتیان لەو بەرنامە زانستی یە کردووە، گوایـە بـەبیانووی پابـەند بـوون بەقورئان و حەدیسەوە.

٣.... گروپی یەکەم واتە ئەوانەی کە پێمان ووتن (ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت) زۆر جـار لەسـەر هـەندێک مەسـەلە ناکۆک بـوون، کـە ئـەو نـاکۆکی یـەش شـتێکی سروشـتی بـووە، چونکـە ئـەو بەرنامەیـەی کـە لەسـەری ڕێکـەوتوون، وای لێکـردوون کـە لەسـەر هـەندێک مەسـەلە ڕای جیاجیان هەبێت، بەڵام ئەوە بەمانای ئەوە نیە کە لەسەر شتە سەرەکی یەکان یەک ڕا نەبوون، بەڵکو لەسەر شتی وابووە کە لەزانستی (أصول)دا پێی دەوترێت (تحقیق المناط) واتە تەتبیق کردنی یاسا گشتی یەکان بەسەر مەسەلە بچوکەکان، (الجزئیات).

٤ ـ کاتێک ئەوەمان بۆ دەرکەوت کە بنەمای پەیڕەوی ڕێگای ڕاست پابەند بوونە بـەقورئان و حەدیسـەوە، لـەژێر ڕۆشـنایی بەرنامـە دیـاری کراوەکـەدا، کەواتـە هیـچ مەودایـەک نامێنێتـەوە بـۆ ئـەوەی بوترێـت، کـە (سـەلەفی یـەت) دەبێتـە پێوانـەی ڕاسـتی و چـەوتی مەسەلەکان، چونکـە وەک ووتمـان، مەبەسـت لـە(سـەلەف) ئەوانـەن کـە لـەسێ چەرخەکـەدا ژیاون، بەڵام پێوەری ڕاستی یەکە، بەرنامەکەو قورئـان و حەدیسـە، چ بـۆ سـەلەف و چ بـۆ کەسانی تر، کەواتە سەلەفی یەت بەڵگـە نـی یـە. بـۆ زیـاتر ڕوونکردنـەوەی ئـەم مەسـەلەیە دەڵێین: زۆر لەوانەی کە بەسەلەف لەقەڵەم دەدرێن، زۆر جار لەم پێوەرە دەرچوون و بەوەش لەریزی کۆمەڵەی حەدیس و ڕای گشتی دەرکراون. کەواتە ئەوەی کە موسوڵمانان بەیەکـەوە دەبەستێتەوە، ئەو بەرنامە زانستی یە پتەوەیە، جا هەر کـەس خۆی بەدڵسـۆزی (سـەلەف) دەزانێت، پێویستە ئەوە بزانێت، کە ئەوان هەمیشە پابەندی ئەو بەرنامەیە بوون و، هەرگیز لەوە لایان نەداوە، ئێسـتاش هەر موسوڵمانێک خۆی بەپابەندی ئەو بەرنامە بزانێت، ئـەوە لەسەر ڕێی ڕاستەو هیچ جیاوازی یـەک لـەنێوان (سـەلەف)و (خەلـەف)دا نی یە. لـێرەدا پێویسـتە جـارێکی تـر نامـاژە بـۆ ئـەو تایبەتمەندیانـە بکـەین، کـە (سـەلەف) بویـانن و،

کەسێکی تر دوای ئەوان بۆی نەرەخساون، با بزانین ئەو تایبەتمەندی یانە چی بوون؟ ئاشکرایە ئەمانە دەوری مامۆستایەتیان هەبووە، بۆ چینەکانی دوای خۆیان، چ لەبارەی وەرگرتن لەقورئان و حەدیسەوە، چ لەبارەی دۆزینەوەی ئەو بەرنامە زانستی یەی کە لەشی کردنەوەی دەقەکاندا
بەکاریان هێناوە. بۆ نمونە: ئیمامی (شافعی) کە یەکێکە لەپیاوە گەورەکانی (سەلەف) ئەگەر بەدوای قسەی ئەوانەی پێش خۆی نەکەوتایە، نەی ئەتوانی ئەو هەموو بنەماو یاسایانە دەربارەی شی کردنەوەی دەقەکان بنوسێتەوە، هەروەک چۆن زانایانی زمانی عەرەبی، نەیان دەتوانی ئەو هەموو رێساو بنەمایانە بنوسنەوە ئەگەر وازیان لەوانەی پێش خۆیان بهێنایە. واتە (سەلەفە)کان واسیتەی نێوان ئێمەو دەقەکانی قورئان و حەدیسن، وە ئیمە شوین ئەوان کەوتوین. چونکە ئەوانە بەراستی بەرنامەیەکی راست و دروستیان هەبووە، بۆ تێگەیشتنی دەقەکان، سەرەرای ئەوەی کە لەپێغەمبەرەوە نزیک بوون و، دوور بوون لەئارەزوو بەکار هێنان و سەرلێشێوان. ئیمە پشتگیری لەو قسەیە ناکەین، کە زاناکانی (کلام) زۆر جار ووتویانە: شی کردنەوەی ئایەتەکانی صیفاتی خوا لەلایەن (سەلەفە)وە سەلامەت ترەو، هی دوای ئەوان زانایانە ترە، چونکە ئێمە پێمان وایە، ئەگەر تێگەیشتنی ئەوانەی دوایی بەجۆریک بێت، کە بەتەواوی لەرێگای ئەوانەی پێش خۆیان لابدات، ئەوە ئاشکرایە کە رای سەلەفەکان باشترە، بەلام ئەگەر هەردوو راکە لەژێر رۆشنایی ئەو بەرنامە زانستی یەدا بێت، کە باسمان کرد، ئەوا هەردوو لا لەسەر حەقن و خواش پاداشتی باشەیان دەداتەوە، جا یا بەدوو پاداشت یان بەیەک پاداشت..
(من أصاب له أجران ومن أخطأ فله أجر واحد).



**بەشی سێیەم :**

# کردنی سەلەفیەت بەمەزەب کارێکی بیدعەیەو شوێن کەوتنی سەلەف رێی پێ نادات

## أ- جیاوازی لەنێوان کردن بە(مەزەب)و شوێن کەوتن دا:-

کورتەی ئەوەی لەدوو بەشەکەی پێشووی ئەم کتێبەدا زانیمان، ئەوەبوو کە شوێن کەوتنی سەلەفە، کردەوە باشەکان و هەڵبژاردنی رێرەوەکەیان لەتێگەیشتنی قورئان و حەدیس و کار پێکردنیان، ئەرکی سەر شانی هەموو موسوڵمانێکە، بەگوێرەی ئەوەی کە موسوڵمانەو پابەندی قورئان و حەدیسە ، خوای گەورە فرمانمان پێ دەکات، کە گوێ رایەڵی پێغەمبەرەکەی بین و ، لەقسەی نەچینە دەرەوە (وَمَاآتَاكُمُ الرَّسُولُ فَخُذُوهُ وَمَانَهَاكُمْ عَنْهُ فَأنْتَهُوا) الحشر/٧.

هەروەها پێغەمبەریش داوامان لێ دەکات، کە شوێن رێگەی خۆی و هاوەڵەکانی بکەوین، پاشان ئەوانەی بەکردەوە، باشی ناودار بوون لە هەر سێ چەرخەکەداوەک ئەفەرموێت :-

(أياكم ومحدثات الأمور. فانها ضلالة. فمن ادرك ذلك منكم فعليه بسنتي. وسنة الخلفاء الراشدين المهدين. عضوا عليها بالنواجذ..) دیارە ئەم وەسفە بۆ ئەوەیە کە شوێنیان بکەوین.

بەڵام هەروەک ئەوەمان زانی، ئەوەشمان زانی، کە کردنی سەلەفی یەت بەمەزەبێکی تازە لەسەر بنەمایەکی دەمارگیری شتێکی ترەو ، پەیوەندی بەو شوێن کەوتنەوە نیەو ، لەگەڵیا یەک ناگرنەوە.

کەواتە بابزانین ئەو جیاوازی یە چیە ، کە لەنێوان کردن بەمەزەب و شوێن کەوتندا هەیە ؟ لەوەڵامدا دەڵێین: جیاوازی یەکە وەک جیاوازی نێوان ئەو دوو وشەیە کە بوترێ (محمدیین) (مسلمین) ، ئاشکرایە ووشەی (محمدیین) کە بۆ ناو نانی موسوڵمانان بەکار بهێنرێت، ئەوە کاری زۆربەی لێکۆڵەرەوەو رۆژهەلاتناسە بیبیانی یەکانە، کە لەدیدی ئیسلامەوە بەکارێکی چەوتی دادەنێت، چونکە مانای ئەم ووشەیە ئەوەیە، کە موسوڵمانان سەر بەخودی حەزرەتی (محمد)ن و ، پابەندی بیرو راکانن، کە تایبەتن بەخۆی، بەلام ووشەی (مسلمین) مانای مل کەچی بۆ دەسەلاتی خواو ، وەرگرتنی هەر شتێک کە بەهۆی حەزرەتی(محمد)ەوە پێمان گەیشتبێ، کەواتە کۆبوونەوەیان لەدەوری حەزرەتی (محمد)و گوێ رایەڵی کردنی فەرمانەکانی، لەراستیدا گوێ رایەڵی خوایەو ، کە ئەویشیان خۆش دەوێت هەر لەبەر ئەوەیە کە نێرراوی خوایە . جیاوازی نێوان ئەو دوو وشەیە چۆن بەئاشکرا

بۆت دەرکەوت، جیاوازی نێوان (التمذهب ـ الأتباع) هەر بەو شێوەیە ئاشکرایە، کە ووتمان (سەلەفیەت دەکەینە مەزهەب) ئەوە مانای ئەوەیە کە سەلەفەکان مەزەبێکی تایبەتیان هەیە، کە جیاوازە لەمەزهەبی موسوڵمانەکانی تر، پاشان هەرچی سەر بەم مەزەبە بوو، ئەوانەن کە دەبێت پێیان بوترێت موسوڵمان، واتە ئاینی ئیسلام دەبێتە شوێن کەوتوی ئەوان و، چی ئەوان بەباشی بزانن ئەوا ئاینی ئیسلام پەسەندی دەکات ئەگینا نکولی لێ دەکات.

بەڵام (شوێن کەوتنی سەلەف) بەمانا ی ڕێز لێ گرتنی ئەو کەسانەیە کە پێغەمبەر ( ﷺ )فەرمانی پێ کردوین کە ڕێزیان لێ بگرین، ئەوانەی کە بەتەواوی دڵسۆزی ئاینەکەیان بوون، لەوانەی لەو سێ چەرخەدا ژیاون، هەروەها مانای ئەوەیە کە لەتێگەیشتنی ئیسلام و ئەو بەرنامەیەی کە دایان ڕشتوە بۆ وەرگرتن لەقورئان و حەدیس دا شوێنیان دەکەوین، کەواتە ئەوەی شوێنی دەکەوین ئیسلامە نەک سەلەف، تەرازووی بەرزی و نزمی ئەوانیش هەر بەهۆی ئەم ئاینەوە بووە، هەبووە لەو چەرخەش دا ژیاوە، بەڵام لەبەر ئەوەی کە پابەندی بەرنامەکە نەبووە، لەریزی ئەوانە دەرچووەو خۆی لەو ڕێزە بێ بەشکردووە، ئا ئەمەیە جیاوازی یەکە. ئاشکراشە کە دووەم (شوێن کەوتن) کاکڵەی ئاینەو، بنچینەیەکی پتەوی ڕێبازی پێغەمبەری مەزنە، بەڵام یەکەم (التمذهب) داهێنانی شتێکە، کە خوا ڕێگای پێ نادات و، بەدرێژایی مێژویش شتی وەها نەبووە.

لە هەر سێ چەرخەکەی سەرەتای ئیسلام دا کەس نەیبیستوە یان نەیدیوە کە مەزەبێک بووبێت، پێی بوترێت (مەزەبی سەلەف) کە لەموسوڵمانەکانی تری جیا بکاتەوەو، ئیتر هەر کەسێک کە سەر بەو مەزهەبە بوبێت پایەی بەرز بێت و ئەگینا پلەو پایەی نزم بێت.

ئەوەی کە پێی بوترێت تایبەتمەندی شتێکی تر بووە، ئەویش پابەند بوونی ئەو کەسانەی کە لەو سێ چەرخەدا ژیاون بەئاینە ڕاستەکەوە، وە پاشان تێگەیشتن و کار پێ کردنی دەقە ئاینی یەکان، بەپێی بەرنامە زانستی یەکەی کە لەوەو پێش باسمان کرد، جا هەر کەسێک ئەم تایبەتمەندی یەی بوبێت ، ئەوا گەورەترین و بەرزترین پلەو پایەی بۆ خۆی پەیدا کردووە، بەوەش بوەتە ئەندامێکی بەکەڵکی ناو موسوڵمانان.

بەپێچەوانەشەوە، هەر کەس شەرەفی ئەو تایبەتمەندی یەی نەبوبێت، ئەوا خۆی لەکۆمەڵی موسوڵمانان دابڕیوەو، دوورو نزیکی دادی نەداوە. ئێستا بەتەواوی جیاوازی یەکەت بۆ دەرکەوت، وە بۆت ئاشکرا بوو، کە شوێن کەوتن ئەرکی سەرشانی هەموو موسوڵمانێکە، بەڵام (تمذهب) کارێکی (بدعە)یەو هەرگیز لەو چەرخە پێشینانەدا نەبووە . جا ئەگەر ڕاست بێت، ئەوەی ئەمانەی ئیمڕۆ دەیانەوێت ( سەلەفی یەت) بکەن بەمەزەبێکی

سەربەخۆ، کەواتە نەبێت ئەوەش ڕاست بێت کە هەندێک ناوی خۆیان بنێن (راشدین) واتە شوێن کەوتوانی خەلیفەکانی ڕاشدین، خۆ ئەمانە دەتوانن بەڵگەی بەهێز لەحەدیسی (علیکم بسنتي وسنة الخلفاء الراشدين) وەربگرن، کەچی نەووتراوە (الراشدین)ەیان کۆمەڵێک ناوی خۆیان بنێن (صحابيين) بەم شێوە یەکپارچەیی موسوڵمانان پەرت و بڵاو دەبێت و، لەو بەرنامە ئیسلامی یە ڕاستە لا نەدەن، کە پێشینەکانی لەسەر بوون. ڕاستە ئەوانیش لەسەر چەند مەسەلەیەک ناکۆک بوون. بەڵام ئەو ناکۆکی یە وای لێ نەکردون کە یەکتر لەکەدار بکەن و، ڕای لایەنەکەی تر بەهەڵە بزانن، بەڵکو هەموویان لەژێر ڕۆشنایی یەک بەرنامەی زانستی دا کاریان کردووەو، مەبەستی سەرەکی یان بەرز کردنەوەی ئاڵای ئیسلامەتی و، ڕێنمایی خەڵکی نەزان بووە، نەک پێک هێنانی کۆمەڵەو گروپ.

رەنگە هەبێت بپرسێت: ئەی ئەوە نی یە (سەلەفی)یەکان دەربارەی مەسائیلی شەرعی (اجتهاد)یان کردووە، پاشان ناکۆکی یە (اجتهاد)یەکان کردونی بەچەند پارچەو گروپێکەوە، وەک چوار مەزهەبە بەناوبانگەکە؟

لەوەڵام دا دەڵێین:

ئەو مەزهەبانە بریتی بوون لەچەند ڕایەکی (اجتهاد)ی، کە لەئەنجامی لێکۆڵینەوەو، ورد بوونەوە پێیان شارەزا بوون، بەڵام خۆیان لەناو خۆیاندا پەیوەندییان زۆر بەهێز بووەو، هەموشیان لەژێر ئاڵای کۆمەڵی ئیسلامیدا کاریان کردووەو یارمەتی یەکتریان داوە.

جا ئەگەر بەراوردێک لەنێوان ئەو مەزهەبانەو ئەم کۆمەڵانەی ئێستادا بکرێت، کە هەر کەسەو بۆ خۆی گروپێکی تازەی دروست کردووەو، کەوتۆتە بەربەرەکانێ لەگەڵ ئەوانی ترداو هەرچی ڕای خۆی نەبێت بەهەڵەی دەزانێت، ئەوا بەئاشکرا دەردەکەوێت، کە ئەوەی ئەو چوارمەزهەبە زۆر جیاواز بووە لەوەی ئێستا.

پاش ئەوەی کە جیاوازی نێوان دوو ووشەکەمان ڕوونکردەوە، ئێستا بەدرێژی بەڵگە لەسەر ئەوە دێنینەوە کە (کردنی سەلەفیەت بەمەزهەب) شتێکی تازەیە لەئیسلام دا، لەبەرئەوە بە(بیدعە) دادەنرێت و، بەهیچ جۆرێک لەگەڵ شوێن کەوتنی سەلەف دا یەک ناگرنەوە.

**ب ... بەڵگەی ئەوەی کە (سەلەفی یەت کردن بەمەزهەب) کارێکی (بیدعە)یە**

دیارە (سەلەفی یەت کردن بەمەزهەب) لەکەیەکەوە سەری هەڵداوە؟

هەمومان ئەوە دەزانین کە لەچەرخی سەلەفەکاندا، چەند گروپێکی بەدەر لەئەتەوەی ئیسلامی، وەک خاوەن کتێبەکان وهی تر دەژیان، هەشیان بوو کە بەناو بەئیسلام حیساب دەکران، بەڵام لەڕاستیدا لەو بەرنامە زانستی یەی کە هەموو لەسەری ڕێک کەوتبوون، لایان دابوو، جا لەبەر هەر هۆیەک بێت، کە ئەمانەش لەناوخۆیاندا ببوون بەچەند گروپ و

تیرەیەکەوە، بەڵام لەپاڵ ئەمانەدا، بەشە هەرە زۆرەکەی موسوڵمانان دەژیان، کە لەسەر ڕێگە ڕاستەکەی پێغەمبەر ( ﷺ ) بوون، کە پێیان دەوترا (ئەهلی سوننەت و جەماعەت)، ئیمە لێرەدا باسی گروپە گومڕاکان ناکەین، بەڵکو دەمانەوێت بەدرێژی باسی کۆمەڵی موسوڵمانە ڕاستەقینەکان بکەین، بابزانین ئەم ناوەیان، واتە (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) لەبەرچی وەرگرتووەو، هۆی چی یە کە پێغەمبەر ( ﷺ ) لەچەند حەدیسێک دا داوامان لێ دەکات، کە پەیرەوی ڕێرەوەکەی ئەوان بین و، گوێ ڕایەڵی ڕاکانیان بین؟

هەروەکو چەند جارێک لەمەوپیش ئاماژەمان بۆکرد، هۆی ئەم شەرەف و پایە بەرزی یەیان هەر ئەوە بووە، کە هەمیشە پابەندی بەرنامە زانستی یەکە بوون، ئەو بەرنامەیەی کە کەڵکی لەحوکمی عەقلی و نەقڵی وەردەگرت و، پاشان زۆر بەباشی پابەندی یاساکانی زمانی عەرەبی بوون و، لەشی کردنەوەی دەقەکاندا رەچاویان دەکردن، هەروەها بەهۆی نزیکی یان لەپێغەمبەرەوە ، ئاگایان لەشێوەی تێگەیشتنی لەقورئان بوو و ئاگاداری (اجتهاد)ی صەحابەکان بوون، بەڵام ئەوە، پێویستە بوترێت ئەوەیە:ـ کە ئەمانە هەرگیز دروشمێکی تایبەت بەخۆیان هەڵنەگرتبوو، کە لەگروپەکانی تریان جیا بکاتەوە، وەک ئەوەی بەخۆیان بڵێین (سەلەفی) یان شتێکی تر، چونکە ئەگەر کارێکی وایان بکردایە بێگومان گروپەکانی تریشی دەگرتەوە. کەواتە یەکێتی ریزەکانیان و، پتەو بوونی تەنها لەوەوە سەری هەڵدابوو، کە بەتەواوی پابەندی بەرنامەو، باش تێگەیشتنی قورئان و حەدیس و بنەماکانی ئیجتهاد بوون.

تا بەم شێوەیە دەرکەوت ئەو (سەلەفیەتەی ئەمڕۆ) بۆتە ویردی سەر زاری زۆر لەخەڵکان، لەو کاتەدا هەر نەبووە، وە بیریشیان لێ نەکردۆتەوە.

بەدرێژایی مێژووی ئیسلام، کەس نەیبیستووە کە نیشانەی ئاینی ڕاست ئەوە بێت، کە پیاو سەر بەمەزهەبی سەلەفی بێت، ئەگینا ئەوە گومڕایی یەو لەرێی ڕاست لایداوە.

ئەی کەواتە بابزانین ئەم دیاردەیەی ئەمڕۆ سەری هەڵداوە لەچی یەوە هاتووە؟

ئەو دیاردەیەی کە بووەتە هۆی ئاڵەوەی دوو بەرەکی لەسەرانسەری جیهانی ئیسلامیدا، تەنانەت زۆر شوێنی ئەوروپاشی گرتۆتەوە، وە لەم کاتەدا کە خەڵکی زۆری ئەوروپا دەیانەوێت ئیسلام بن.

ڕەنگە بۆ یەکەم جار ئەم دروشمە (سەلەفیەت) لەمیسردا لەسەردەمی داگیر کردنی لەلایەن بەریتانیاوە سەری هەڵدابێت، ئەو کاتەی کە بزوتنەوەی گۆڕانی ئاینی پەیدا بوو بەسەرکردایەتی(جمال الدین ئەفغانی و محمد عبده).

هۆیەکەیشی دەگەڕێتەوە بۆ بارودۆخی میسر لەو کاتەدا: هەرچەند بەناو (ئەزهەر)و زاناکانی خەریکی جم و جۆلی زانستی یانە بوون، لەناو ئەزهەرو سەرتاپای میسردا، بەڵام

لەگەڵ ئەوەش دا ببووە شوێنی بڵاو بوونەوەی شتی خەرافیات و پرو پووچ، کە هیچ پەیوەندی یان بەئیسلامەوە نەبوو، لەوەش سەیرتر ئەوەبوو کە بەناوی (تصوف)ەوە، وە لەژێر ئالای تەریقەتەکاندا ئەو شتانەیان بڵاو دەکردەوە.
جاریٚ لەناو (أزهر)دا هەموو جم و جۆڵە زانستی یەکان، بریتی بوون لەرەسم و یاسای بەروالەت و بێ سوودو، موناقەشاتی ساردو ووشک و بێ مانا، کە بەهیچ جۆرێک پەیوەندییان بەژیانی خەڵک و واقیعی ئەو رۆژە نەبوو، زانایانی ئەزهەرسیش نەک هەر لەناو کۆمەڵەوە هەڵنەقولابوون، بەڵکو هەستیان بەوەش نەدەکرد کە ئەبێت خەریکی گۆرانکاری بن بەرەو باشتر، تەنانەت ناو ژوورو گۆرەپان و کۆلانەکانی دەوروبەریشی، پڕ بوون لەزەبل و پیسایی کە بەتەواوی خەڵکی لێ دوور دەکەوتنەوە.
جەماوەری موسوڵمانانی میسریش، بەرامبەر بەم واقیعە لەکەدارە بوبوون بەدوو بەشەوە:
بەشێکیان پێی وابوو کە باشتر وایە خۆی بگەیەنیتە کاروانی شارستانی یەتی رۆژئاواو، واز لەو واقیعە بینێت تەنانەت ئەگەر لەئیسلامیش دوور بکەویتەوە.
بەشێکی تریش پێیان وابوو، پێویستە کاروباری موسوڵمانان چاک بکرێت، بەوەی کە بگەرێنەوە بۆ ئیسلامی پاکی ڕاستەقینەی سەردەمی پێغەمبەرو هاوەڵەکانی و، ئیسلام لەو گۆشەگیری یەی کە زاناکانی ئەزهەر بۆیان دروستکردوە رزگار بکەن، وە بیانخەنە سەر رێگای ڕاست و، بەرێرەوی ژیانی نوێ پێکەوە ژیان لەگەڵ ژیانی شارستانی یەتی تازەدا گۆشیان بکەن و ئاشناً بىن. هەردوو زانای بەناوبانگ (شیخ محمد عبدەو شیخ جمال الدین الافغانی)، پێشەنگی ئەم بەشەیە بوون و، بەیەکەوە ئالای بانگەشە بۆ ئەم چاک کردنەیان هەڵگرتبوو..

لەبەرئەوەی هەموو بانگەشەیەکی (اصلاح) پێویستە دروشمیکی تایبەت بەخۆی هەڵبگرێت، تاخەڵکەکە شارەزای بن و بەرەو لای بکیشن، ئەمانیش دروشمی (سەلەفیەت)یان هەڵبژاردو، کردیانە دروشمی بانگەوازەکەیان، ئەو شیعارەش لای ئەوان بەو مانایە بوو، کە پیویستە ئیسلام لە هەموو ئەو چلک و خەرافیات و کاری پروو پووچ و، نارەوایانە پاک بکرێتەوە، بەشێوەیەک کە ڕووە گەشە ڕاستەقینەکەی دەربکەوێت، وە خەڵکەکە بگەرێتەوە سەر ئیسلامەتی سەردەمی پیغەمبەر( ﷺ )و هاوەڵەکان و، ببێتە ئاینی کردەوەو هەوڵدان و کۆشش، نەک جۆلانەی خەوو دواکەوتوویی لەهەوڵەکانی ژیان.
دەیانتوانی لەبری ئەم دروشمە، دروشمیکی تری وەک (الأسلام) هەڵبژێرن، بەلام وادیارە سەرکردەکانی ئەم بزوتنەوەیە، دەیانویست هەستی موسولمانان بورووژێنن و، هانیان بدەن تابەراورد لەنێوان ئەو واقیعە تالە تاریکەی نیستایان و، واقیعە گەشە پرشنگدارەکەی

چەرخەکانی یەکەمی ئیسلام بکەن، کەواتە لەم سەردەمەو، لەبەر ئەو هۆیانەی کە ڕوونمان کردنەوە، ئەم دروشمە هاتە کایەوە لەلایەن سەرکردەکانی بزووتنەوەکەوە وەک (محمد عبده و جمال الدین الافغانی و رشید رضا و عبدالرحمن الکواکبی)و هی ترەوە بەکارهێنرا، ئاشکرایە کە مەبەستیان لەبەکارهێنانی ئەو دروشمە، مانای پێکهێنانی مەزهەبێکی نوێ نەبووە، وەک ئەمرۆ هەندێک دەیکەن، بەڵکو تەنها مەبەستیان دژایەتی ئەو کەسانە بوو، کە ئیسلامیان لەرێگە ڕاستەکە لادا بوو، وە بەشتی پرووپوچ لەکەداریان کردبوو. پێویستە ئەوەش بوترێت کە لەم سەرکردانە، لەو کاتەی کە دەیانویست لە(سەلەف) نزیک ببنەوە. لەهەمان کاتیشدا لەهەندێک ڕاوو بۆچوون دا، لەسەر ڕاو بۆچوونی ئەوان نەبوون، وەک لەهەندێک (فتوا)و نوسینیان دەربارەی هەندێک مەسەلەوە دەردەکەویت.
ئەم بزوتنەوەیە، دەوریکی ئیجگار کاریگەری هەبوو، لەبلاو بوونەوەی ئەم دروشمە (سەلەفیەت) لەناو رۆشنبیران و تویژەکانی کۆمەڵدا، هەر ئەوەش بوو بوو بەهۆی ئەوەی کە لەسەرەتای ئەم سەدەیەدا بەتەواوی بلاو ببێتەوە، تەنانەت بکرێت بەناوی (چاپخانە . نامەخانە) وەک چاپخانەو نامەخانە بەناوبانگەکەی میسر، کە بەو ناوەوە ناو نرابوو لەلایەن (محب الدین الخطیب)ەوە بەرێوە دەبرا.
هەر لەم ماوەیەدا بوو، کە مەزهەبی (وەهابی) کە بەسەرکردەی (محمد بن عبدالوهاب) (١١١٥ـ ١٢٠٦ک) (١٧٠٣ـ ١٧٩٢ زاینی) پەیدا ببوو و، بەتەواوی لەولاتی (نجد)و هەندێ شوینی نیوە دورگەی عەرەب دا بلاو ببویەوەو، لەنێوان ئەم مەزهەبەو بزووتنەوەی (الأصلاح الدینی)دا، چەند شتێکی هاوبەشی هەبوو، وەک: دژایەتی خەرافیات و شتە پرووپوچەکان، هەر لەبەر ئەمەش بوو کە ئەم ووشەیە لەناو ریزەکانی ئەوانیشدا بلاو بۆوە. تەنانەت بەشێوەیەک کە لەبری ووشەی (الوهابیه) وشەی (السلفیه)یان بەکار دەهێنا، چونکە بەکارهێنانی (الوهابیه) مانای ئەوەی دەگرتەوە، کە ئەو دامەزرێنەری ئەو مەزهەبەیە، کە ئەمەش نرخێکی زۆر بەمەزهەبەکەیان نادات، بەلام (السلفیه) وا لەخەڵکەکە دەکات، کەوا بزانێ ئەم مەزهەبە تازە نیە، بەڵکو دەچێتەوە سەر سەلەف و ئەمانیش هەلگری ڕاستەقینەی بیری ئەوانن... ئا بەم شیوەیە ئەو ووشەیەی کە کرابوو بەدروشمی بزوتنەوەیەکی چاکەکار، بوو بەناوی مەزهەبێکی نوێ، کە شوێن کەوتوەکانی پێیان وایە، کە هەر ئەوان لەسەر ڕێی ڕاستن و، کەسی تر بێجگە لەوان لەسەر عەقیدەی (سەلەف) نی یەو، هەر ئەوان لەئیسلام گەیشتوون و، خەڵکی تر هەموویان گومڕاو سەرلێشیواون..!!

**ج/ کردنی سەلەفیەت بەمەزهەب کارێکی (بیدعە)یەو لەوە پێش نەبووە .**

ئێمە پێمان وایە، ئەگەر بوترێت باشترین وسەرکەوتووترین گرۆی موسولمانان ئەوانەن، کە ناومان نان بە (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) ئەوە کارێکی (بدعە)مان نەکردووەو، لەرێرەوی بەشی هەرە زۆری موسولمانان لامان نەداوە، چونکە بەسەدان بەلگەمان بەدەستەوەیە، کە لەقورئان و حەدیس دا داوا لەموسلمانان دەکات، کە خۆیان لەو گروپەدا جێگیر بکەن.

بەلام ئەگەر یەکێک بەخۆی بلێ من لەسەر مەزهبی (سەلەفی)یەتم، ئەوە ئاشکرایە کە کارێکی (بیدعە) دەکات، چونکە ئەگەر مەبەستی لەو ووشەیە، هەمان مانای (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) بێت، ئەوا لەخۆیەوە ناوێکی تازە دادەهێنێت، تا یەک پارچەیی موسولمانان تێک بدات.

خۆ ئەگەر مانایەکی تریان مەبەست بێ، ئەوا وشەکەو ماناکەشی هەردوکیان (بیدعە)ن.

ئاشکراشە ئەوانەی ئەمرۆ بەخۆیان دەلێن (سەلەفی)، ئەوانەن کە خۆیان بەکۆمەلێ راو بۆچوونی (اجتهاد)ی یەوە بەستۆتەوەو، دیفاعیان لی دەکەن و، هەرچی لەگەلیان نەبێت بەگومراو سەرلێ شێواویان دەدەنە قەلەم، چ لەبارەی مەسەلە عەقائیدی یەکانەوە، چ لەبارەی ئەحکامی شەرعی و هەلس و کەوتی رۆژانەوە بێت.

ئێمە بەدرێژی دەربارەی ئەو راو بۆچوونانە دواین و، روونمان کردەوە، کە مەسەلەکان هەموویان دەگەرێنەوە بۆ بەرنامە زانستی یەکە، ئەگەر بەپێی ئەو بەرنامەیە رێگای ئەو بۆچوونانە هەبێت، ئەوا هەموو پاداشتی خۆیان وەردەگرن و، بەوەش لەکۆمەلێ موسولمانان جیا نابنەوە. لەمەویەریش ئەوەمان ئاشکرا کرد، کە راو بۆچوونەکانی (سەلەفی)یەکان، بەپێی بەرنامەکە ئەگەری راستیان هەیە، بەلام را بەرامبەرەکەشی هەمان ئەگەری هەیە، کەواتە زال کردنی لایەک بەسەر لاکەی ترا، کارێکی نارەوایەو، دەبێتە هۆی تێکدانی ریزی موسولمانان.

لەلایەکی تریشەوە، لادانە لەو بەرنامەیەی کە زۆربەی زۆری موسولمانان لەسەری رێک کەوتوون و، بەدرێژایی مێژوویش کردویانە بەهۆی پتەو کردنی ریزەکانیان، ئەوەتا لەسەرەتای ئیسلام دا، هەردوو گرۆی (أهـل الـرأي وأهـل الحديث) لەئەنجام دا وەک برا یەکیان گرتەوەو، لەپێناوی حەقیقەتی ئاینی دا درێژەیان بەهەولەکانیان دا. کەچی ئەوانەی ئیمرۆ پشت لەو بەرنامەیە دەکەن و، دەمارگیری دەیانگرێ و، هەرچی لەگەلیان نەبیت بەگومراو سەرلێ شێواوی دەزانن :-

<u>ئەبێت چ (بیدعە)یەک لەمە خراپتر بێت؟.</u>

لەیەکێک لەولاتە عەرەبی یەکاندا، نوێژی خەوتنانمان بە(جەماعەت) دەکرد، پاش تەواو بوونی نوێژەکە یەکێک لەنوێژکەرەکان دەستی هەڵبری و کەوتە پارانەوە لەبەر خوا، ئێمەش هەموو ئەمان ووت (آمین)، کەچی یەکێک لەوانەی کە خۆی بە(سەلەفی) دەزانی، بەپەلە کوڕەکەی بەجێ هێشت و دوورکەوتەوە، کە لێمان پرسی بۆچی دوورکەوتیتەوە؟
لەوەلام دا ووتی: هەرگیز لەسەردەمی پیغەمبەردا باو نەبووە، کە پاش نوێژ کردن دوعا بکرێت. بەڵکو لەناو نوێژەکەدا دەکرێت؟.
لێرەدا ئەوەی کە لەم پیاوەی بە(بیدعە) دەزانین ئەوە نیە کە لایەنی ئەو رایە دەگرێت، کە پێویستە دوعا لەکاتی نوێژدا بکرێت، چونکە زۆر لەئیمامەکانیش رایان وابووە، ئەوەتا لەحەدیسی (سعد بن ابی وقاص)دا هاتووە، کە هەمیشە منالەکانی فێر دەکرد، کە ئەم دۆعایە بخوێنن و ئەی فەرموو: (ان رسول الله كان يتعبد بهن دبر الصلاة: اللهم أني أعوذ بك من البخل وأعوذبك من الجبن وأعوذ بك ان أرد الى أرذل العمر واعوذ بك من فتنة الدنيا وأعوذ بك من عذاب القبر) ئەو ئیمامانە ووشەی (دبر الصلاة) بەمانای کۆتایی نوێژەکە لێک دەدەنەوە واتە پێش سەلام دانەوە، بەلام بەشی زۆری ئیمامەکان پێیان وایە مەبەست لەمە، دوای تەواو بوونی نوێژەکە، بەڵگەشیان ئەوەیە کە ووشەی (دبر) لەزمانی عەرەبیدا بەو مەبەستە بەکاردێت، هەروەها حەدیسی (ام سلمە) کە دەفەرموێت (ان النبي كان يقول اذا صلى الصبح حين يسلم، اللهم اني اسألك علما نافعا ورزقا طيبا وعملا متقبلا)..
بەڵێ ئەوەی ئێمە لەو پیاوەی بەراست نازانین ئەوە نیە، بەڵکو لەوەیە کە ئەو پێی وایە کە پێویستە رایەک هەڵبژێرێت و، راکەی تر بەهەلە بزانیت، جا هەر کەسیش لەسەر ئەو رایە بیت، ئەوە نیشانەی ئەوەیە کە رێگای چەوتی هەڵبژاردووەو، پێویستە وازی لێ بهێنیت، ئەوەتا کوڕەکە بەجێ دەهێڵێت، چونکە ئەو پێی وایە ئەوانەی کە ئەو کارەیان کردووە لەگرۆی موسوڵمانان نین.
جا ئایا نەبێ هیچ زانایەکی سەلەفی کارێکی وەهای کردبێت و، راکانی خەڵکی تری پوچەڵ کردبێتەوە؟!
زۆر جار ئێمەو زۆر لەموسولمانانی (ئەهلی سوننەت و جەماعەت) بەوە تۆمەتمان دەخەنە پاڵ و پێمان دەڵێن (مبتدع)، چونکە پیمان وایە ئەگەر یەکێک بیەوێت بەنیازی زیارەت کردنی گۆری پیغەمبەر(ﷺ) بچێتە مەدینە، هیچ کارێکی خراپی نەکردووە، کە ئەمەش رای بەشی زۆری موسوڵمانانە، کەچی ئەوان بەرایەکی خراپی دەزانن، لەگەڵ ئەوەش دا کە (حەنبەلی)یەکانیش بەباشی دەزانن، بەلام مادام گرۆی (سەلەف) پێیان باش نیە، ئەوا

ئەوەیان بەلاوە گرنگ نیە، کە بەشی زۆری موسوڵمانان لەگەڵ ئەو رایەی ئەواندانین و، ئەو بەڵگانەش کە (ابن تیمیه) پشتیان پێ دەبەستێت زۆر لاوازن، ئەوەی لای ئەوان گرنگە ئەوەیە، مادەم (سەلەفیەت) بەخراپی دەزانێ خراپە، ئیتر گەرانەوەی بۆ نیەو نابێت کەس بەنیازی زیارەتی گۆری پێغەمبەر سەردانی مەدینە بکات، ئا بەم شێوەیە ناکۆکی لەسەر مەسەلەیەکی وەها وەک خەنجەرێکی ژەهراوی کۆمەڵەی موسوڵمانان بچڕ بچڕ دەکەن و، خەڵکەکە بەدوو گروپ دابەش دەکات، (سەلەفیەت) کە هەر ئەوان ڕاستخوازن، (بیدعە گەرێتی ) کە لەراستی دوورن.
ئەمەیە ڕای سەلەفی یەکان، جا حەقە بپرسین: ئاهۆ هەرگیز سەلەف خەنجەری وەهای بەکار هێناوەو، بەم شێوە کۆمەڵەی موسوڵمانانی پارچە پارچە کردووە؟
دیارە کەشتی وا هەرگیز نەبووە.
لەنەدوەیەک دا کە یەکێک لەسەلەفی یەکان قسەی تیا دەکردو، باسی مەزهەبەکەیان و کەسایەتی یە مێژوویەکانیانی دەکرد، باسی (ئیمامی حەنبەلی)ی کردو، هەڵوێستی دەربارەی (خلق القرآن) پشی دەکردەوە، کە چۆن تووشی چەرمەسەری هاتووە، لەسەر ئەوەی کە سوور بووە لەسەر هەڵوێستەکەی و، ئنجا هاتە سەر باسی ئەوەی، کە یەکێک لەو بەڵگانەی کە دەری ئەخات کە (ابن تیمیە) سەلەفی بووە، ڕایەکی تریش هەیە کە تایبەتە بەخۆیەوەو، پێی وایە سێ تەڵاقە یەک تەڵاقی پێ دەکەوێت، منیش کە ڕاسپێراوم دەربارەی قسەکانی وەڵام بدەمەوە، پێم ووت: ئەگەر ئەو بۆچوونەی کە پێی وابێت کە سێ تەڵاقە تەڵاقێکی پێ دەکەوێت، لەتایبەتمەندی یەکانی مەزهەبی سەلەفی بێت، ئەوا ئەبێت ئیمامی (أحمد) سەلەفی نەبێت، چونکە ئەو پێی وایە کە سێ تەڵاقی پێ دەکەوێت، هەروەها سێ ئیمامەکەی تریش لەچوار ئیمامەکە هەمان ڕایان هەیە، کەواتە ئەوانیش سەلەفی نین و، ئەگەر ئەو هەڵوێستەی ئیمامی (احمد) کەتوشی ئەو هەموو چەرمەسەریەی کرد، تایبەتمەندی سەلەفیەتی بێت، کەواتە دەبێت ئیمامی شافیعی سەلەفی نەبێت، کە هاوچەرخی ئەو بووە، چونکە ئەو هەڵوێستەی نەبووە، هەمووشمان ئەوەمان زانی، کە هەموو موسوڵمانان لەپێش هەموشیانەوە چوار ئیمامەکە لەسەر ئەوە یەک ڕان، کە (کلام الله) دروستکراوو (حادث) نیە، ئەو چەرمەسەریەش کە تووشی ئیمام احمد بوو، تەنها لەبەر ئەوە بوو، کە نەیدەویست جیاوازی لەنێوان ووشەکان و ماناکانی قورئان بکات، دەترسا لەوەی کە سەر لەخەڵک بشێوێنێ و، لەرۆژی قیامەت دا گوناهبار بێت. ئێستا هیچ گومان نەما، کە سەلەفیەت مەزهەبێکی تازە داهێنراوە لەئایین داو، بنەماکانی لەسەر چەند ڕایەکی ( ئیجتیهاد )ی هەڵبژاراووە ودامەزراوە، کەزۆر،

لەزانایانی پێشوو قسەیان لەبارەوە کردووە، بەڵام ئەمان کردویانن بەراسترین ڕاو، دەڵێن هەرچی لەو ڕایانە لابدات ئەوە گومڕاو سەرلێشێواوە.
ئەمە بێجگە لەوەی کە (بیدعە)یەکی ڕێ پێ نەدراوە، هیچ شتێکی تر نیە، وە لەوەوپێش شتی وەها نەبوو، سەرەڕای ئەوەش کە بوەتە هۆی بڵاو بوونەوەی دوبەرەکی لەناو موسوڵمانان داو، تادێت تەشەنە دەکات، لەبەر ڕۆشنایی دەمارگیری ڕەوانی و منیەتی بەکۆمەڵ (الأنانية الجماعية) کە لەمەودوا باسی دەکەین...

**ئەو کاریگەرە خراپانەی کە تووشی میللەتی ئیسلام دەبێت لەئەنجامی ئەم (بیدعە) وە:**

کاریگەرە خراپی یەکان زۆرن و، ئەگەر بمانەوێ هەموویان باس بکەین، ئەوە کاتێکی زۆری دەوێت، دەمویست هەموویان لەنامیلکەیەکی تایبەتیدا کۆبکەمەوە، بەڵام دوایی بۆم دەرکەوت کە ئەم کاریگەریانە یەکێکن لەپێداویستی یەکانی سەرهەڵدانی ئەم مەزەبەو بڵاو بوونەوەی و، بڕیاردان لەسەر شەرعیەتی، کەواتە باشتر وایە خەڵکان لەوە ئاگادار بکرێنەوە، کە مەزەبەکە خۆی لەخۆیدا مەزەبێکی (بیدعە)یەو، لەسەر بنەمای دەمارگیری (منیەتی) (الانا) بەکۆمەڵ، دامەزراوە کە لەئەندامانی ئەم مەزەبەدا بەدی دەکرێت.
لەلێکۆڵینەوە ڕەوانی یەکاندا، ئەوە فێر بووین، کە ئەو منیەتی یەی کە ئیسلام نکولی لێ دەکات و، بەکارێکی خراپی ئەزانێت، وە نەبێت هەر لەتاکدا دەربکەوێت، بەڵکو لەناو کۆمەڵیشدا پەیدا دەبێت، زۆر جار چەند کەسێک بەهۆی ڕایەکی تایبەتیەوە بۆ خۆیان کۆمەڵێک پێک دەهێنن و، لەسەر ڕایەکی تایبەتی یەوە یەک دەگرن و، دەمارگیری و منیەتی بەکۆمەڵیان لەناودا بڵاو دەبێتەوە، کە لەئەنجامدا مەترسی زۆریان لێ دەکرێت و، کاریگەری خراپیان لەسەر کۆمەڵگای ئیسلام دەبێت. ئەو منیەتیەش تەنها لە بۆتەی دڵسۆزی ئیسلام و، پابەند بوون بەشەریعەتی پاک و، خۆ پاکردنەوە لەهەوای نەفس دا نەبێت ناتوێتەوەو، لەناو ناچێت.
پاش ئەوەی ئەوەمان ڕونکردەوە، کە ئەم دروشمە (بیدعە)یەو هیچ کەس گومانی لەوەدا نی یە مەگەر ئەوانە نەبێت کە منیەتی تاکی یان کۆمەڵی بەسەر عەقڵ و هۆشیان دا زاڵەو، ئیتر پاشگەز بوونەوەیان بۆ نیە، بۆیە پێویستە ئەو کاریگەریی یەی کە لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی هەیەو خراپە ڕوون بکرێتەوە.

## لێرەدا تەنها دوو شت باس دەکەین:

**یەکەم:** ئەو زیانە زۆرانەی کە لەئەنجامی پەیدا بوونی ئەم بیدعەوە تووشی کۆمەڵی موسوڵمانان دەبن. لەئەنجامی ئەمەوە یەکپارچەیی موسوڵمانان لەناو دەچێت و، لەبری هاریکاری یەکتر، دوبەرەکی دەکەوێتە ناویانەوە، هەموو دەزانین کە ئێستا هیچ شارو

گوندێک نەماوە لەسەرانسەری جیهانی ئیسلام دا، کە پریشکی ئەم ئاگرەی بەرنەکەوتبێ ، کە دوژمنایەتی ورقەبەری جیگای برایەتی و دۆستایەتی گرتۆتەوە. هەموومان دەنگ و باسی ووشیار بوونەوە ئیسلامی یەکەی ئەوروپاو ئەمریکاو ئاسیامان بیستووە، کە بووەتە هۆی دڵخۆشی و شانازیمان، کەچی لەگەڵ ئەوەدا دەنگوباسی ئەم دیاردە خراپە دەبیستین، کە خۆی گەیاندوەتە ئەو شوێنانەش و بوەتە هۆی خەمباری هەموان.
ساڵی ١٤٠٦ک، یەکگرتوی جیهانی ئیسلامی، کۆریکی رۆشنبیری سازدا بوو، منیش یەکێک بووم لەوانەی کە بۆ بەشدار کردن لەو کۆرەدا بانگ کرابووم، وە بۆم رەخسا کە زۆر لەو میوانانەی لەئەوروپاو ئەمریکاو ئاسیاو ئەفریقاوە هاتبوون بناسم، کە زۆربەیان لێپرسراوی مەڵبەندەکانی بانگەشەی ئیسلامی بوون. ئەوەی کە زۆر خەمباری دەکردم ئەوەبوو، کاتێک کە لەبارەی بلاو بوونەوەی بانگەشەی ئیسلامەوە لیّم دەپرسین، هەموویان بەخەم و بەژارەوە ئەوەیان دەوت: گەورەترین کۆسپ کە دێتە رێگایان، ئەو دووبەرەکی و ئاژاوەیەیە کە کۆمەلە ی(سەلەف)ی لەو شوێنانەدا بلاوی دەکەنەوە...
چەند ساڵێک لەمەوبەر، پشێوی و ئاژاوە لەیەکێک لەمزگەوتەکانی (واشنتۆن)دا بوو بەهۆی ئەوەی، کە دەسەلاتدارانی ئەمریکا بچنە ناو مزگەوتەکەوەو، بۆ ماوەی چەند مانگێک دایبخەن.
هەروەها هەمان پشێوی و ئاژاوە لەیەکێک لەمزگەوتەکانی پاریس دا، پێش سێ ساڵ لەمەوبەر، بوو بەهۆی ئەوەی کە پۆلیسی (فەرەنسی) بەزۆر مزگەوتەکە داگیر بکەن و، بچنە ناویەوە، سەیر لەوەدا بوو کاتێک یەکێک لەوانەی کە هۆی ئاکۆکی یەکە بوو، کە ئەبینێ پۆلیسەکان بە پێلاوەوە بەناو مزگەوتەکەدا هاتوچۆ دەکەن، داوایان لێ دەکات کە پێلاوەکانیان دابنێن، ئەوانیش لەوەلام دا پێی دەڵێن: ئاخر ئەگەر ئێوە نەبن، ئێمە چ ئیشمان هەبوو بێینە ئێرە؟.!!
لەیەکێک لەولاتە دوورەکان دا، کە نەتەوەیەکی ئیسلام پارێزگاری لەئاینەکەیان دەکەن و، بەگژ داگیرکەرانی ولات و نیشتمانەکەیان دا دەچنەوە، لەلایەن کۆمەڵەی (سەلەفی)یەوە بەکوفرو (بیدعە) تاوانبار دەکرێن، تەنها لەبەر ئەوەی، چونکە سەردانی گۆرەکانیان بەلاوە کارێکی خراپ نی یەو، (فتوا)شیان لەدژ دەردەکەن، کە نابێت بەهیچ جۆرێک یارمەتی یان بدرێت و، فریاگوزاریان پێش کەش بکرێت.
یەکێک لەزانایانی ئەو نەتەوەیە، بەرویاندا دەتەقیتەوەو پێیان دەڵێت: ئاخر چۆن ئێمە بەکافر دەزانن، لەکاتێکدا کە رۆژی پێنج جار لەبەردەم خوای خۆماندا دەوەستین و دەڵێین: (أیاک نعبد وأیاک نستعین) الفاتحە/ ٥ ؟! بەلام کێ وەلام بداتەوە؟ من گومانم لەوەدا نی یە کە (سەلەفی)یەکان هەموویان وەک یەک نین، هەیانە بەم جۆرە هەڵس و کەوتانە رازی

نی یەو ، خەمی پێ دەخوات بەڵام سودی چیە؟ پاش ئەوەی کە شەرعی یەتیان بەمەزەبەکە داوەو ، ئەشزانن کە بێجگە لەزیان گەیاندن بەکۆمەڵگەی ئیسلام و ، پارچە پارچە کردنی ، هیچ کارێکی تر نی یە.
چارەسەر کردنی ئەم کێشەیە تەنها بەوە دەبیت ، کە ئەو دەرگایەی ئەم مەزەبەی لێوە هاتووە دابخرێت ، ئەویش بەوە دەبێت ، کە ئەو رایەی کە خۆیان بەراستی دەزانن ، لەسەری پابەندبن ، کە ئەوە مافی خۆیانە ، بەمەرجێک ، رای لایەنەکەی تر بەگومرایی نەزانن و ، هەر خۆیان بەراست نەزانن ، پێویستە خۆیان بەبەشێک لەکۆمەڵگای ئیسلامی بزانن ، واتە : (ئەهلی سوننەت و جەماعەت ) نەک دژایەتی بکەن.
ئێمە لەمەوبەر ئەوەمان بەدرێژی باس کرد ، کە چۆن مەسائیلی (اجتهاد)ی ، لەگەل مەسەلەی بنەرەتی یەکان لێک جیا نەکرێنەوەو ، موسوڵمانانی پابەند بەقورئان و حەدیس ، ، هەمیشە لەمەسەلەکانیان کۆڵیوەتەوە ، گەلێ جاریش ناکۆکی یان لەناودا پەیدا بووە ، بەڵام ئەوە نەبۆتە هۆی دووبەرەکی و ئاژاوە نانەوە لەریزی موسوڵمانان داو ، هەریەکە بۆ خۆی مەزەبیکی دیاری کراوی دروست نەکردووە.
بەدرێژایی مێژووی ئیسلام ، هیچ گرۆو تاقمێک ، هەولی پچڕ پچڕ کردنی کۆمەڵەی موسوڵمانانی نەداوە ، بێجگە لەچەند گروپێک نەبێت وەک (الخوارج)و ئەوانی تر کە بە(اجماع)ی موسوڵمانان ئەوانە لەرێگای راستی شەریعەت و بنەماکانی لایان داوەو ، لەو کۆمەڵە دەرکراون.

**دووەم :** پەیدا بوونی ئەم مەزەبە (سەلەفی یەت) بۆ ئەوانەی کە هەڵگری بیری چەپن (الفکر الیساری) بوو بەهۆی خۆشحاڵی یان ، چونکە ئەوە بوو بەپشتگیری بۆچوونە (مارکسی)یەکەیان ، دەربارەی مێژوو کەلەپوور ، چونکە لەیاسای ئەواندا ، واتە (قانون المادیە الجدلیە) گۆرانی بەردەوام میژوو بەرێوە دەبات ، بەلای ئەوانەوە مێژووی عەرەب لەنەزانی یەوە بۆ ئیسلام و ، ئینجا خەلافەتی چوار خەلیفەکەو ئەمەوی و... هتد ، ئەوە دەرئەخات:. کە مێژوو هەمیشە لەگۆراندایە ، بەرەو باریکی مرۆڤایەتی و کۆمەلایەتی باشترو تەواوتر ، واتە لەهەر چەرخێک دا ، چی لەگەڵ بارودۆخەکەدا بگونجێت ، ئەوە بەخۆیەوە دەگرێت ، ئەمە دەربارەی مێژوو ، وە دەربارەی کەلەپووریش هەمان رایان هەیە ، ئەوان قورئان و حەدیس و زانستە ئیسلامی یەکان بەبەشێک لەکەلەپوور دادەنێن.
وە بۆ ئەوەی راکەیان بەسەر مێژووی ئیسلامدا بسەپێنن ، پێویستە مەرجێکی سەرەکی ، کە زۆر لەزانایان داکۆکی لەسەر دەکەن بێتەدی: ، ئەویش پەیدا بوونی ململانێی دژ بەیەکەکانە ، کە دەبێت لەناو رووداوە میژوویی یەکاندا روو بدات ، تاگۆرانە بەردەوامەکە روو بدات.

بەڵام ئەگەر بەووردی سەیری مێژووی ئیسلامی بکەین، ئەو ململانێ یە بەدی ناکەین بەڵکو هەمیشە جێی هاریکاری گرتۆتەوە ، پاش گەڕانێکی زۆر بەدوای ئەم دیاردەی ململانێ یەدا، هیچ شتێکیان بەدی نەکرد، تاپەیدا بوونی ئەم مەزەبە، وایان لەقەڵەم دا کە ئەم ململانێ یەی ئیمرۆ، ئەم مەزەبە بانگەشەی بۆ دەکات، هەر لەبەرەبەیانی پەیدا بوونی ئیسلامەوە هەر بووە.

بەم شێوە بەڕای ئەوان: مێژووی ئیسلامی هەر لەسەرەتای سەرهەلدانی یەوە تائەمرۆ، دوو بۆچوونی دژ بەیەکی بەخۆیەوە دیوە:-

یەکێکیان پێی وایە: کە دەبێت شتە کۆنەکان وەک خۆیان پارێزگاری بکرێن و، نابێت هیچ شتێک لەوانە دەستکاری بکرێت، ئەوی تریشیان پێی وایە، کە پێویستی شتە نوێکان کاریان پێ بکرێت و، ژیان بەپێی پێداویستی یەکانی بگۆڕیت، لەم ململانێی نێوان ئەم دوو بۆچوونە، جولانەوەی مێژوو هەڵقولاوەو، شارستانیە تی ئیسلامی پەیدابووە.

بەڕاستی ئەمە شانازی یەکی گەورەیە بۆ سەلەفی یەکان، کە بەهۆی ئەمانەوە، هەڵگرانی ڕای (مادی مارکسی) ئاواتی دێرینەیان هاتە دی و، بەناو خەڵکدا بلاویان کردەوە، کە ئەوەتا مێژووی ئیسلامیش، لەئەنجامی ململانێی نێوان بەرژەوەندی یەکانەوە پەیدا بووە، کەواتە ڕاکەمان زۆر ڕاستە، کە مێژوو لەگۆڕانیکی بەردەوام دایەو، لەئەنجامی ناکۆکی و ململانێ دێتە پەیدا بوون.!

وە لەسەر ئەم بۆچوونەشیان، چەندان کتیب و دراساتیان نووسیوە، هەموو پاڵپشتێکیشیان ئەم (بیدعە) داهێنراوە بوو، کە بەهیچ جۆریک ڕەگ و ڕیشەی لەمێژووی نەتەوەدا نەبووە. لە هەمووی ناخۆشتر ئەوەیە، کە ئەم برایانە ی کە بەخۆیان دەڵێن (سەلەفی) شت ناخوێننەوەو، ئاگایان لەدەوروبەریان نیەو، نازانن چۆن دوژمنانی ئیسلام دروشمەکانیان بۆ سودی خۆیان بەکار دێنن و، ڕووی گەشی مێژووی ئیسلام دەشێوینن.

هەروەها دوژمنانی ئاینی ئیسلام هەر بەوەشەوە نەوەستاون، بەڵکو ئەمە دەکەنە بەڵگە، لەسەر ئەوەی کە ئیسلام شتێکی جیا نی یە لەبیر ی مرۆڤایەتی، بەڵکو لەئەنجامی چەند بیرێکی مرۆڤایەتی یەوە هاتۆتە کایە. باشترین بەڵگەش، ئەو ململانێ یەیە کە لەنیوان (سەلەفی)یەکانو یەکە پێیان وایە ئیسلامی پیرۆز تەنها ئەوەیە کە ئەوان تێی گەیشتون، وە لەنیوان ئەوانی تردا کە لەگەڵیاندا هاوڕا نین و ڕاکانیان بەپوچەڵ دەزانن.

## وەڵامی زانستی یانەمان بۆ ئەم هەڵگێرانەوەی ڕاستیانە ئەوەیە :

ئەم شیعارو دروشمەی ئەمانە هەلیانگرتووە، شتێکی (بیدعە)یە لەئیسلام دا، وەنەبێت ئەمە یەکەم جار بێت، ئەم جۆرە شتانە ڕوو لەئیسلام بکات، بەڵکو بەدرێژایی مێژووی پرشنگداری، چەند جاریک ئەمانە ی بەخۆیەوە دیوە، بەڵام هەرگیز ئەمانە نەیانتوانیوە هیچ

زیانێک بەم ئایینە بگەیەنن، چونکە سەرچاوەی ئەم ئایینـە، ئـەو دەقانـەن کـە بـە بەڵگـە ی زانستی ساغ بۆتەوە، کە لەسروشتی خوایی یەوە هاتوون نەک بیری مرۆڤ.
وە تێگەیشتنی دەقـەکانیش، لەئەنجامی بەرنامەیـەکی زانسـتیی وە دەبێـت، ئـەوەی کـە هەموویان یـەک رابـوون لەسـەری، لەبەر ئـەوە بـووە، چونکـە بەرنامەکـە وا داوا دەکـات، ئەوەش کە جیاوازی راو بۆچوونیان لەسەری هەیە، هەر لەبەر ئەو بەرنامەیەیە..
جا ئیتر هیچ مەجالێک لەبەردەم ئەواندا نامێنێت، کە پێیـان وایـە ئیسـلام لەئـەنجامی ململانێی فیکری وە ئایدۆلۆجی پەیدا بووە.
بۆ باشترین تێگەیشتنی ئـەم مەسـەلەیەش، باشـتر وایـە، خوێنـەری بـەرێز بگەڕێتـەوە بـۆ بەشەکانی یەکەم و دووەمی ئەم کتێبە .

## کورتەو کۆتایی

ئێستا وا خەریکە کتێبەکەمان بەرەو تەواو بوون دەچێـت، بـۆ جـارێکی تـر دەمـەوێت ئـەوە دووبـارە بکەمـەوە، کـە مەبەسـتی مـن لـەدانانی ئـەم کتێبـە، موناقەشـەی ئـەو بـیرو راو بۆچوونانە نیە، کە سەلەفی یەکان بەهی خۆیـان دەزانـن و، پارێزگاریـان لـیّ دەکـەن، بـەڵکو ئامـانجی مـن تەنـها ئەوەیـە، کـە دەری بخـەم کە داهێنـانی مـەزەبێکی نـویّ، کـە لەچـەند (اجتـهادات)و رایەکی دیـاریکراو پێـک هـاتبێت و، ناونـانی بـەناوێکی وا، کـە لـەوەپێش نـەبوو بێـت، ئنجـا پابـەند بـوون پێـی بەشـێوەیەکی وا، کـە پێـت وابێـت تەنـها ئـەو مـەزەبـە راسـتە، ئیـتر ئـەوانی تـر هـەموویان هەڵـەن و گومـڕان... بـەڵێ ئـەم داهێنانـە کـارێکی (بیدعە)یە، وە زەرەرو زیانێکی ئێجگار زۆری بۆ موسوڵمانان هەیە، هەروەها خاوەنی ئـەو مەزەبە، پێیان وایە کە مەزەبەکەیان نموونەی ئایینی ڕاستەو، دەتوانرێت لەبری ئـەو بەرنامـە زانستی یەی کـە (صـحابە) پـەیڕەوی یـان دەکرد، بۆ وەرگرتنی ئـەحکام لەدەقـەکان بـەکار بهێنرێت، کە ئەمەش نیشانەیەکی تری گومڕایی و سەر لیّ شێواوی یە..
بەڵگـەشمان لەسـەر ئـەم قسـانە بـەکورتی ئەوەیـە : ئـەو نیشـانەیەی کـە پێغەمبـەر ( ﷺ) کردویەتی بەنیشانە بۆ موسوڵمانانی تەواوو رزگار ئەوەیە کە دەبێت، پابەندی کردارو رەفتاری پێغەمبەرو هاوەڵەکانی بن، ئـەم جۆرە موسـوڵمانانەش بـە(ئیتیفـاق)، نـاو نـراون بـە(ئـەهلی سـوننەت و جەماعـەت )، ئـەم نـاوەش لەچـەند ریوایـەتێک دا لەپێغەمبـەرەوە وەرگـیراوە جـا گۆڕیـنی ئـەم نـاوە، بـەناوێکی تـر کـارێکی (بیدعـە)یـە، وەک گۆڕیـنی (المسلمین) بە(المحمدیین) وایە کە لـەوەوپێش بـەدرێژی باسـمـان کـرد .. سـەرەرای ئـەوەش دەپرسین: ئایا مەبەسـتتان لـە(سـەلەف) کـە خـۆتان پێـوە بەسـتۆتەوە، لـەبـەر ئـەوەیـە چـونکە ئەوانـە لـەو سـیّ چەرخـەی سـەرەتای ئیسـلام دا ژیـاون، یـان لەبەر ئەوەیـە چونکـە

لەعەقیدەو هەڵس و کەوتدا ملکەچی قورئـان و حـەدیس بـوون؟ ئەگـەر مەبەسـتتان مانـای یەکەم بێت، ئەوا ئەو چەرخە بێجگە لەموسـوڵمانان، چـەندان تـیرەو گـرۆو زندیـق و کـافری تیا ژیاوە، ئایا دەبێت ئەمانەش بکرێنە پێشەنگی ئەوانەی بەخۆیان دەڵێن (سەلەفی)؟.
ئەگەر مەبەستتان مانای دووەم بێت، ئەوە ئاشکرایە کە زۆر لەوانەی کە بەڕاستی گومـڕاو سەرلێشێواون، بەڕای خۆیان پابەندی قورئان و حەدیسن، بەڵام ئەوەی کە دەری ئـەخات کـە ئەمانە ڕاست ناکەن، ئەو بەرنامەیەیە کە پێغەمبەرو هاوڕێکانی پەیڕەویان کردووە، چونکە ئەمانە لەسەر ئەوە ناڕۆن و پابەند ی بنەماکانی نین.
کەواتە جیاکەرەوەی ڕاست لەچەوت و، موسوڵمانی تەواو لەگومڕا ئـەو بەرنامەیەیـە، واتـە هەر کەسێک پابەندی بوو، ئەوە موسوڵمانی تـەواوەو ڕێگـای ڕاسـتی گرتـووە، جـا لـە هـەر چەرخێک دا ژیا بێت، هەر کەسێکیش لەو بەرنامەیە لابدات، ئەوە گومـڕاو سەرلێشـێواوە لـە هەرچـەرخێکدا ژیـا بێـت یـا بژیـت. ئاشکراشـە وەک لەمەوبـەر ڕونمـان کـردەوە، کـە بنـەماکانی ئـەم بەرنامەیـە، هەیانـە جێـی (اجمـاع)ی هـەموو زانایـانی زمــانی عـەرەبی و شەریعەتی ئیسلامی یە، هەشیانە چەند ئەگەرێک هەڵدەگرێت، جا هەرچی لـەجۆری یەکـەم بێت ئەوا ئەو ئەحکامانەی لەو بنەمایانەوە وەردەگیرێن، دیسان هەمووان پێی ڕازی دەبـن، مەگـەر یـەکێکی نـەزان، یـان گومـڕا، وە هـەرچی لەبەشـی دووەم بێـت ئـەوا ئـەحکام و دەرئەنجامەکانیان دیسان چەند ئەگەرێک هەڵئەگرێت، لەبەر ئەوە زاناکـان ناچـار دەبـن کـە ڕای جیاجیایـان لـەسـەر ئـەو جۆرە مەسـەلانە هـەبێت، ئـەم جیاوازیـەش شـتێکی سروشـتی یەوکەس بۆی نی یە ڕای لایەکەی تر بەهەڵە یان بەگومڕا بزانێت.
زۆربەی ئەو ڕایانەی کە (سەلەفی)یەکان خۆیانی پێـوە خـەریک دەکـەن و، خـەڵکی دژیـان بـەگومڕاو نـەزان لەقەڵـەم دەدەن، لـەم جـۆری دووەمەیـە کـە کـاتی خـۆی موسـوڵمانان لەبارەیانـەوە دواون، وە ڕای دژ بەیـەکیان لەیـەکتر قبـوڵ کـردووەو، هـەرگیز لایـەنێک لایەنەکەی تری بـەگومڕا لەقەڵـەم نـەداوە، دەتوانیـت زۆر بەئاسـانی لـەو هۆیـە بگـەیت، کـە بۆچی (سەلەفی)یەکان تەنها ڕای خۆیان بەڕاست دەزانن و، خەڵکی تر بەگومڕا؟
ئـەوەش لەئـەنجامی ئەوەوەیـە، کـە کۆبونـەوە لـەسـەر دروشمێکـی تـازە گیـانی دەمارگـیری دەوروژێنـێ و، هەسـتی منیـەتی کۆمـەڵی (الانانیـە الجماعیـە) دەهـەژێنێ و، نـارەزووی سەرکەوتن لەدەروونیاندا دروست دەکات، ئیتر ئـەم هۆیانـە وایـان لـیّ دەکـات، کـە چاویـان لەڕاسـتی و حـەق و عەدالـەت کوێر ببێ و، تەنـها، تەنـها خۆیـان بەپاڵـەوانی مـەیدانەکـە بزانن.
لێرەدا تەنها نموونەیەکی بچووک دەنوسین، کە لەکتێبی یەکێک لەسـەرکردەکانی (سـەلەفی یەت)دا نوسراوەو، بەچاوی خۆت دەبینیت، چۆن هێرش دەباتە سەر موسوڵمانێکی ئەهلی

سونەت و جەماعەت، کە بەدرێژایی ژیانی بێجگە لەقسەی باش و کردەوەی باش، کەس خراپەیەکی لێ نەدیوە، چۆن دەیکات بەکافرو گومڕاو سەر لێشێواو. نموونەکە:
موتابەعەی ئەو ژەهرانەم کرد، کە ئەو گومڕاو گومڕاکەرە دەیڕژێنێت بەسەر عەقیدەی سەلەفی یەتدا، بەو کتێبانەی کە بڵاویان دەکاتەوە...] زۆر عیبارەتی لەمە ناشیرینتری تیایە، بەڵام بۆیە هەر ئەم کۆپلەیەمان هەڵبژارد، تاسەرنجی خوێنەر بۆ ووشەی (العقیدە السلفیە) ڕابکێشین، کە لەبری (العقیدەالاسلامیە) بەکار هاتووە، وا دیارە ئەوەی وا تەنگە تاوی کردووە، دیفاع لەعەقیدەی ئیسلامی و ئایینی ڕاستی بەشی هەرە زۆری موسوڵمانان نیە، بەڵکو دەیەوێت بەهەر جۆریک بێت، کە مەزهەبەکەی خۆی سەر بخات، وە بووە بەبەشێک لەکەسایەتی خۆی.
سەرنج بدە، ئەبینی چۆن هاوەڵ و هاومەزهەبەکانی هان ئەدات، کە بەگژ ئەو زانایەدا بچنەوە تەنها لەبەر ئەوەی کە لەمەزهەبەکەیان دواوەو، حەقیقەتەکانی دەرخستووە، ئیتر بێ ئەوەی گوێ بدەنە ئەوەی ئەم پیاوە موسوڵمانەو، هیچ کارێکی خراپی بەئیسلام نەکردووە.
من پیم وایە هەر کەسێک واز لەدەمارگیری مەزهەبی و، خۆشەویستی سەرکەوتنی خۆی بهێنێت، زۆر چاک ئەوە دەزانێت کە ئیسلامەی دلانی دژ بەیەک ئاشت نەکاتەوەو، ڕیزە پچڕ پچڕەکان یەک دەخاتەوەو موسوڵمانان فێری هاریکاری دەکات، هەرگیز بەوە ڕازی نابێت کە پارچەیەکی بەنرخ لە لەشی ئیسلام جیا بکرێتەوە، بەناوی مەزهەبێکی تازەوە، ئنجا دووبەرەکی بکەوێتە نیوانیانەوە.
بەڵێ ئەو ئیسلامەی کە دوینێ تیرە دژ بەیەکەکانی کردەیەک و، کردنی بەهوونەی یەکێتی و برایەتی هەرگیز نابێت و ناکرێت هەر ئەو ئیسلامە ئەمڕۆ ببێتە هۆی تێکدانی ڕیزەکانی موسوڵمانان وە دژایەتی بخاتە نێو ڕیزەکانیانەوە.
بەکورتی: ئێمە داوای ئەوەیان لێ ناکەین، کە واز لەو ڕاو بۆچوونە (اجتهاد)ی یەیان بهێنن، بەڵکو ئەوەی ئێمە لێ یان داوا دەکەین ئەوەیە، کە ئەو شتانە نەکەن بەحەقیقەتی ئایینی ئیسلام و، پێیان وابێت هەرچی لەوەلایدا ئیتر گومڕاو سەر لێشێواوە، چونکە ئەوانە مەسائیلی (اجتهاد)ین و، هەموو کەس بۆی هەیە کە بەپێی بۆچوونی خۆی بیر لەو مەسەلانە بکاتەوە، هەروەها دەمانەوێت ئەوەیان بیر بخەینەوە، کە ڕیگای (اجتهاد) لەو جۆرە مەسەلانەدا شتێک نی یە کە سەلەفی یەت دای هێنا بێت، بەڵکو ڕێگای ئەوە، شوێن کەوتنی ئەو بنەماو یاسایانەیە کە سەرکردەکانی هەردوو قوتابخانەی ڕاو حەدیسی یەک گرتەوەو، پاشان زۆربەی موسوڵمانانی لەدەوری خۆی کۆکردەوە.
تۆ بڵێی ئەو برایانە بەدەنگ ئەم بانگەوازەمانەوە بێن؟ ئەو برایانەمان کە هەمیشە وای بڵاو دەکەنەوە، کە گوایا دژ بەشتی (بیدعە)ن و، بەدوای حەق و حەقیقەت دا ویڵن و،

بانگەشە بۆ حەق دەکەن، بەلاّم بەداخەوە بەتەواوی لەناو دەریای دەمارگیری و خۆویستی دا نقوم بوون و، زۆر لەو شتانەی کە خەلکی لی دوور دەخەنەوە، خۆیان تا بینەقاقایان نقوم بوون و، ناتوانن خۆیان رزگار بکەن..... تۆ بلێی فەسلەکانی ئەم کتێبە بخوێننەوەو، واز لەدەمارگیری یەکەیان بهێنن و، بگەرینەوە ناو رێبی کۆمەلاّنی یەک بووی موسولمانان، وە کەلینەکان پر بکەنەوەو، برینەکان ساریژ بکەن و بەسەنگیکی فراوانەوە قسەی هەمووان وەربگرن، وە نکولی لەو شتانە نەکەن کە لەزەروراتی ئایینن و دەبێت هەموو بیان زانن.
ئەوە ئاواتمە..
خواش پشتیوانی هەمووانەو ئاگاداری دلاّنە.

تەواو بوو



# بابەت و سەرباسەکان

| بــابــەت | لاپــەڕە |
|---|---|